* ناوی کتێب: چاوەش
* لێکۆڵینەوەو ئامادەکردنی: سەید نەجمەدین ئەنیسی
* سەرپەرشتی هونەری و بەرگ: عوسمان پیرداود.
* نەخشەسازی: رزگار موحسن
* چاپ: چاپخانەی حاجی هاشم – هەولێر.
* لەبڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی ژمارە (١٦٦ ).
* تیراژ: ٥٠٠ دانە.
* لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی(      )ی ساڵی ٢٠١٢ی پێدراوە.

**چۆن ئەم کتێبەم ئامادە کرد.**

هەر لە کات و سەردەمی لاوەتییەوە ئارەزووم بوو کە شیعرەکانی سەیید ڕەشید، کە بە دوو نازناوی «چاوەش» و «شەهید» دایناون، کۆ بکەمەوە و لە دیوانێکدا چاپیان بکەم.

ئارەزووی دڵ و دەروون هانی دەدام کە سوور بم لە جێبەجێ کردن و بەدیهێنانی ئەو ئاواتە؛ بڕیارم دا دەستنووسی دیوانەکەی وەدەست بێنم و لە فەوتان و تێداچوون ڕزگاری بکەم.

شاعیری زانا و خواناس و نیشتمانپەروەری کورد، خوالێخۆشبوو مامۆستا «خاڵەمین»ی بەرزەنجی، بەشێکی زۆر لە شیعر و قسە خۆشەکانی سەیید ڕەشیدی لەبەربوون و یادداشتی کردبوون. دڵسۆزانە یارمەتییەکی باشی دام و یادداشتەکانی خۆی پێدام. شاعیری پایەبەرز و بەناوبانگ، مامۆستا «هەژار»ی نەمریش، بەشێک لە شیعر و قسە خۆشەکانی «سەیید»ی لەبەربوون و نووسیبوونیەوە، ئەویش زۆر دڵسۆزانە یارمەتی دام. مامۆستای ئایینپەروەر، مامۆستا مەلا ڕەحمانی خەلیفەزادە، ئیمام جومعەی بۆکان، لە ماڵی خۆی بەیازێکی زۆر بەنرخ و نایابی پێبەخشیم کە زۆر شیعری کوردی و فارسی سەیید ڕەشیدی تێدا بوون. هەروەها سوودێکی زۆریشم لە کتێبی «شمس‌الدین برهانی» دۆستی بەڕێز و خۆشەویستم کاک ئەبوبەکری خوانچەسپێهرەدین وەرگرت کە لە بارەی ژیانی حەزرەتی شێخ یوسف شەمسەدین «شێخی بورهان» و هەندێ لە مرید و مەنسووبە ناودارەکانی نووسراوە؛ وەکو شاعیری زانا و خواناسی کورد حاجی «سەیید محەمەدسەعیدی کولیجی» و شاعیری ناسک خەیاڵی کورد «مەلا ساڵحی حەریق» و مەولانا «محەمەدسادقی مەرزەنگ» و «میسباحوددیوانی ئەدەب» و «عەلیبەگی حەیدەری» و مامۆستا «سەیفولقوزات» و سەیید ڕەشید.

تێکۆشان و هەوڵدان بۆ یەکخستنی ئیملا و ڕێنووسی کوردی و هەنگاونان لەم بوارەدا ئەرکێکی گرینگە، بەتایبەت مەسەلەی

نووسینەوەی دیوانی شیعر و بەرهەمی کۆن بە خەتی کۆن زۆر زەحمەتە. تێکستەکانم وەکو خۆی بەبێ دەسکاری و گۆڕین خستووەتە ڕوو، تەنیا ئەوە نەبێ بە ئیملا و ڕێنووسی کوردی ئەمڕۆم نووسیوەتەوە.

هیوادارم ئەم دیوانە بچووکەی «چاوەش» بە شانازییەوە جێگای خۆی لە کتێبخانەی کوردیدا بکاتەوە.

## چاوەش
## سەیید ڕەشیدی خانەقا
## «١٢٤٠ ـ ١٣١٥»ی هەتاوی «١٨٦١ ـ ١٩٣٦»ی زایینی

**وەرە سەر گۆڕی «شەهید»ی دڵتەر     هەموو دونیا لە بەرێ، ئەو لەو بەر**
**«چاوەش»ی پیر بە هەوای زانستی     لــــە مـــلی شێری دەخستن ڕســـتی**

**«هەژار»**

سەیید ڕەشید کوڕی سەیید حەسەن کوڕی سەیید عەلی، لە سەییدەکانی «زینوێ شێخی»یە و دایکی ناوی ڕابیعە بووە. باپیری، واتە سەیید عەلی، ماڵی چۆتە ئاوایی «دووئـــاوان» لە ناوچەی شنۆ. سەیید ڕەشید ساڵی «١٢٤٠»ی هەتاوی «١٨٦١»ی زایینی لە «دووئاوان» لە دایک بووە. سەیید حەسەنی باوکی بێجگە لە سەیید ڕەشید شەش کوڕ و کچێکی تریشی بووە و دوای ماوەیەک ماڵی چۆتە دێی «نەڵۆس» هەر لەو ناوچەیە و لەوێ لەگەڵ خوالێخۆشبوو پیرۆتئاغای مامەش، کوڕی گەورەی محەمەدئاغای مامەش، کە پیاوێکی خواناس و ئایینپەروەر بووە، بووە بە دۆست و ئاشنا و هەر ئەویش سەیید ڕەشیدی بردۆتە ئاستانەی شێخ یوسف شەمسەددینی بورهانی.

بنەماڵەی سەیید ڕەشید دوای چەند ساڵ ماڵیان لە دێی «نەڵۆس»ەوە چووە بۆ گوندی «کەڵەکێن»ی ناوچەی پیرانشار. پاشان لە گوندەکانی تری ناوچەی پیرانشار بڵاوبوونەتەوە و ئێستاش برازاکانی هەر لەو ناوچەیەدا دەژین.

سەیید ڕەشید هەر لە سەرەتای منداڵییەوە بە هۆی هۆش و بیر و زەکاوەت و زیرەکی لە ڕادەبەدەری خۆی سەرنجی باوکی ڕاکێشاوە بۆ ئەوەی پێی بخوێنێ و بینێرێ بۆ خوێندنگای ئایینی و حوجرەی فەقێیان. هەر بەم هۆیەوە سەیید ڕەشیدی لەبەر خوێندن ناوە و سەیید دەستی کردووە بە خوێندنی ئایینی و دینی بە شێوەی باوی ئەو سەردەمە. لە پێشدا قورئانی پیرۆز و سەرف ونەحوی عەرەبی

و گولستان و بۆستان و ئەدەبی فارسی خوێندووە.
پاشان بۆ درێژەدان بە خوێندن و فێر بوونی زانست و زانیاری چووە بۆ زۆر شوێن و ناوچەی جۆراوجۆر لە کوردستانی ئێران و عێراق و لەو گەشت و گەڕانەدا بە فەقێیەتی هاتۆتە شاری سابلاغ (مەهاباد) و لەگەڵ زانایان و پیاوە گەورەکانی ئەم شارە، کە زۆربەیان لە مریدان و مەسنووبانی شێخی بورهان بوون، بووە بە دۆست و ئاشنا.
دۆستایەتی و هاونشینی لەگەڵ ئەم پیاوە گەورە و زانا و دڵپاکانە بووە بە هۆی ئەوە کە لەگەڵیان بچێ بۆ گوندی «شەرەفکەند» و بە خزمەت شێخ یوسف شەمسی بورهانی بگا. لە ئەنجاما چووە بۆ زیارەتیی و تەریقەتی لێوەرگرتووە و چۆتە ڕیزی مریدان و مەنسووبانی ئەو شێخەوە.
سەیید ڕەشید هەر لە سەرەتای تەمەسسوکەوە بە هۆی بلیمەتی و زانایی و زیرەکی و زمانپاراوی و ڕەوانبێژی و بیر و هەست و هۆشی لە ڕادەبەدەر و خوو و ڕەوشتی بەرز و جوان، سەرنجی شێخی بۆ لای خۆی ڕاکێشاوە و پاشان لە نێو مریدان و مەنسووبان‌دا ڕێز و خۆشەویستییەکی زۆری پەیدا کردووە. سەیید ڕەشید بووە بە یەکێک لە نیزیکان و خۆشەویستانی شێخ و ناوبانگی بە هەموو شوێن و ناوچەیەکی ئەم کوردەوارییەدا بڵاوبۆتەوە.
شایانی باسە بەر لە چوونی سەیید ڕەشید بۆ شەرەفکەند، هەندێکی کەم لە مریدان و مەنسووبان توانیویانە ڕاستەوخۆ لەگەڵ شێخی بورهان قسە و گفتوگۆ بکەن و بێباکانە هەموو قسەوباس و مەبەستێکی پێڕابگەیەنن، بەڵام سەیید ڕەشید هەر وەکو گوتمان بە هۆی زیرەکی و زانایی و بلیمەتیی توانیویەتی سەرنج و خۆشەویستی و دڵ و هۆشی شێخ بۆ لای خۆی ڕابکێشێ. جاروبار بە هۆی هۆشیاری و حازرجوابی لە حزووری شێخدا، بە قسەی خۆش و جەفەنگی موئەدەبانە و ژیرانە حاڵوهەوای وتو وێژی بگۆڕێ.
تەنیا لە کەسێکی هۆشیار و هەڵکەوتووی وەک سەیید ڕەشید وەشاوەتەوە کە لەبەرانبەر ئەم خواناسە گەورەیەدا، بەو هەموو سام و هەیبەت و شکۆیەی کە هەیبوو، بێباکانە سەری قسە و گفتوگۆ بکاتەوە و وەڵامی پرسیارەکانی بداتەوە.

بە هۆی ئەو هەموو زانایی و زیرەکی و زمانپاراوی و ڕەوانبێژییەوە بوو کە شێخ نازناوی «چاوەش»ی پێبەخشی و هەر بەم نازناوەشەوە بانگی دەکرد.

سەیید ڕەشید لە پێشدا نازناوی «شەهید»ی بۆ شیعرەکانی خۆی هەڵبژاردبوو؛ لە بەر خۆشەویستی شێخ کردی بە «چاوەش».

سەیید ڕەشید لە سەردەمی فەقێیەتی‌دا بە خزمەت شێخ گەیشت. هێشتا خوێندنی تەواو نەکردبوو، چووە نێو دونیای تەسەووف و سۆفیزمەوە. هەر بەم هۆیەوە ماوەیەک دەستی لە خوێندن هەڵگرت. دوایە ڕووی لە خوێندنگاکانی ئایینی و حوجرەی فەقێیان کردەوە. ماوەیەک لە گوندی «ساحێب»ی ناوچەی سەقز لە لای شاعیری بەناوبانگ و ناسک خەیاڵی کورد «حەریق» درێژەی بە خوێندن دا. پاشان گەڕایەوە بۆ مەهاباد و لە مزگەوتی «ڕۆستەمبەگ» لە خزمەت مامۆستا مەلا حوسێنی سەقزی مایەوە.

لەو سەردەمەدا بوو کە هەندێ ئینسانی سپڵە و خوانەناس بڵاویان کردەوە کە سەیید ڕەشید لەباتی خوێندن، زۆربەی کاتی خۆی لە پێناو کار و کردەوەی چەوت و خراپدا بەخت دەکا و هاونشینی و هاوڕێتی کەسانی خوو و ڕەوشت خراپ و ناپاک دەکا!! ئەم قسەیە وردە وردە پەرەی گرت و تەنانەت بە گوێی شێخیش گەیشتەوە؛ لە ئاکامدا سەیید ڕەشید ماوەیەک لە لوتف و خۆشەویستی و دیدار و فەیزی کۆڕ و مەجلیسی شێخ بێبەش و بێ بەهرە مایەوە.

ئەو مەبەستە بۆ سەیید ڕەشید کە یەکەمین پیاڵەی لە بادەی زوڵاڵی ئەوین و خۆشەویستی نۆشیبوو و بە کەمەندی ئەم مورشید و پیرە پیرۆز و پارێزگارە گرفتار ببوو، زۆر سەخت و دەرداوی بوو. ماوەیەکی زۆر لە خانەقا بە دڵێکی مات و غەمگین و پڕ لە خەفەت و تەنیایی دانیشت و چاوەڕوانی نیگایەکی پڕ لە بزە و خۆشەویستی شێخ بوو. ئەو مەبەستە هەر وا مایەوە و کەسێک نەبوو بتوانێ لەو نێوەدا ببێ بە نێوبژیوان و دڵی شێخ چا بکاتەوە و دڵی ئەم شاعیرە ناسک خەیاڵە و ئەم بولبولە خۆشئاواز و دەنگزوڵاڵەش لە خەم و خەفەت ڕزگار بکا، بە ناچاری پەنای بۆ شیعر برد و ئەو هەڵبەستە فارسییە پڕ لە هەست و سۆزەی دانا و دای بە یەکێک لە نزیکانی شێخ بۆ ئەوەی لە هەل و دەرفەتێکی چاک‌دا بۆی بخوێنێتەوە:

## خسرو دین

| | |
|---|---|
| ای خسرو دیـــــــن به ایزد پاکم بخش | وی قطب یقین به شاه لولاکم بخش |
| شد خـــــاک درت زنـــــــدەدلان را مأمن | ای پاک ز کین تو بدین خاکم بخش |
| در بـآغ جهان چــون خر بی افسارم | نبود گنهی که در نیست در انبارم |
| بـــــا این همه امید بـــــه عفوت دارم | زیــن رو که سگ سگان ایــن دربـــارم |
| از تـــو طلبم کـــه نفس بـــر بـــاد شود | بیچاره دلـــــــــم ز غصه آزاد شود |
| دشمن ز سیەروزی من بس شاد است | ای دوســـت مبین که دشمنم شاد شود |
| ای نائب بی شریک در رد و قبـــــول | وی یـــار و غمگسار هر زار و ملول |
| «چـــاوش» که بود ظلوم و بیچاره جهول | اول به خداش بخش و ثانی به رسول |

کاتێ ئەم شیعرە پڕ لە هەست و سۆزە و ئەم ناڵە دڵ و گیانسووتێنەرەیان بۆ شێخ خوێندەوە، بە تەواوی کاری لە دڵ و دەروونی کرد و فەرمووی: بە سێ شەرت دووبارە ڕایدەگرمەوە، یەکەم ئەوەیە کە دەبێ بە یەکجاری دەست لە خوێندن هەڵگرێ و چیدی نەخوێنێ و بۆ هەمیشە لە خانەقادا نیشتەجێ بێ، دووەم: ژن نەهێنێ، سێیەم: چایی نەخواتەوە.

سەیید دوو شەرتەکەی ئەوەڵی خێرا قەبووڵ کرد و تا دواپشووی ژیانی ئەم دوو شەرتەی لەبەرچاو گرت و بەجێی هێنا، بەڵام هێندەی چایی پێخۆش بوو نەیتوانی دەستی لێ هەڵگرێ و شێخیش زۆر سەختی لێ نەگرت و جاروبار بە تانە و تەشەر و سەرزەنشت کردنێک قەناعەتی دەکرد.

دوای ئەم بەسەرهات و ڕووداوە سەیید بۆ هەمیشە لە خانەقادا نیشتەجێ بوو، بە هۆی پێوەندی نزیک و خۆشەویستی شێخ، بە تەواوی چووە نێو جیهانی خواناسی و سۆفیەتی و سۆفیزمەوە. هێندەی پێنەچوو کە بە هۆی زانایی و زیرەکی و زمانپاراوی و ژیری، بوو بە پیاوێکی پایەبەرز و شاعیرێکی ناسکخەیاڵ و بەهرەمەند و لە «خانەقا» و لە نێو مریدان و مەنسووبانی شێخدا ناوبانگی بە هەموو شوێن و ناوچەکانی ئەم کوردەوارییەدا بڵاو بۆوە.

سیما و ڕوخسارێکی نووورانی، ڕیشێکی پڕ و درێژ، بەژن

و باڵایەکی ڕێکوپێک، جلوبەرگی جوان و خاوێن، زمانپاراوی، قسەخۆش و دڵڕفێنەکانی ـ کە زیاتر تام و چێژی شۆخی و گاڵتە و گەپیان پێوە بوو ـ ئەوەندی تری لەبەر دڵان و خۆشەویست و شیرین کردبوو. هەر کەس دەیبینی، پڕ بە گیان و دڵ خۆشی دەویست و جازیبەیەکی تایبەتی پێ بەخشیبوو؛ بەتایبەت کاتی گفتوگۆ و قسە کردن و دانی پەند و ئامۆژگاری بۆ ماوەی چەندین ساعەت سەرنجی گوێدێران و بیستیارانی بۆ لای خۆی ڕادەکێشا.

سەیید جگە لەو هەموو خوو و ڕەوشتە بەرز و جوانانە و بەهرەمەندییەی، دەنگێکی خۆش و زوڵاڵ و ئاوازێکی گیانپەروەر و دڵنشینی هەبوو. کاتێ قورئانی خوێندووە، شوێنی قووڵی کردۆتەسەر دڵو دەروون و گیانی گوێدێران. سەیید ئیجازەی خوێندنی قورئانی پێشتر لە قورئانخوێنانی بەناوبانگی «خانەقا» وەرگرتووە و بۆ لەبەر کردنی چەند ساڵێک زەحمەتی کێشاوە.

ئەم هەموو گەورەیی و هونەرمەندی و بەهرەمەندییە بۆتە هۆی ئەوە کە سەیید ببێ بە سەر ئاڵقەی خەتمی «خانەقا» و حەزرەتی شێخیش ئەم ئەرکە گەورە و گران و گرینگەی پێبسپێرێ. سەیید دوای وەفاتی شێخیش تا دواپشووی ژیانی هەر لەسەر ئەم ئەرک و کارە گرینگە مایەوە.، تەنیا جاروبار خوالێخۆشبوو شێخ محەمەدی کوڕی شێخ لە جیاتی «سەیید» ئەم ئەرکەی وەئەستۆ گرتووە.

دوای ڕۆیشتنی «مەولانا محەمەدسادق»یش بۆ ناوچەی وان، خەزنەداری و مەوقووفاتی خانەقا هەر بە سەیید سپێردرا و تا ئەو کاتەی مەولانا لە وان گەڕاوەتەوە، حیسابی دەخل و خەرجیش هەر سەیید ڕایگرتووە. تەنانەت نامە نووسین و نامە ناردن و پاراستنی مەدرەک و سەنەد و بارهێنان و پەروەردە کردنی هەندێ لە کوڕەکانی شێخیش یەکێک بووە لەو ئەرکانەی کە پێی سپێردراوە.

سەیید لەسەر ئەو هەموو کار و ئەرک و پایەبەرزی و ڕێزەی کە هەیبووە، ژیانێکی زۆر سادە و ساکار و سۆفیانەی گرتۆتە بەر. خواردنی هەر ئەو خواردن و خواردەمەنییەی مەنسووبان و سالیکانی خانەقا بووە. لە ماڵ و سامانی دنیا هیچ شتێکی نەبووە

که دڵی پێ ببەستێ و لە ژیانیدا تەنیا عەلاقە و پێوەندی بە سیغار و چاییەوە بووە. لە سەر ئەوەش زۆر جار کەوتۆتە بەر تانە و تەشەر و سەرزەنشتی شێخ و هەموو جارێ بە وەڵامدانەوەیەکی جوان و ژیرانە و زیرەکانە و حازرجوابی و قسەیەکی خۆش و نەستەق خۆی ڕزگار کردووە.

سەیید سیغار و چایی زۆر پێخۆش بووە و بەتایبەت هەر خۆی چایی ساز کردووە و نەیهێشتووە کەسێکی تر یارمەتی بدا. مامۆستا هەژار، شاعیری هەڵکەوتووی کورد، لە شیعری «بەرەو موکریان»دا سەبارەت بە «سەیید» دەڵێ:

**کێ وەکوو «سەییدی» دەس و دڵبازە؟**
**تووتنی کۆنی هەبێ و چای تازە**

دوای وەفاتی شێخیش بە هۆی زانایی و زیرەکی و لێهاتوویی، مەنسووبان و سالیکان زۆریان خۆشویستووە و بە ناوی نووسەر و ئەمیندار و یادگاری شێخ زۆریان ڕێز لێگرتووە.

سەیید بە هۆی ئەو هەموو ڕێزە و پلە و پایەبەرزییە کە هەیبووە توانیویەتی پێوەندیەکی قووڵ لەگەڵ سەرۆک ئێل و عەشیرەت و پیاوە گەورەکانی ناوچە بگرێ؛ نامەی بۆ ناردوون و نامەیان بۆ نووسیوە. سەیید لە نامە جوان و پڕ لە تەنزەکانیدا لەگەڵ زۆربەیان گاڵتە و گەپ و جەفەنگی لێداوە و هیچ کام لەو سەرۆکعەشرەت و پیاوە گەورانە قسەی ئەویان وە دڵ نەگرتووە و تەنانەت شانازیشیان بە قسە و گاڵتە و گەپەکانییەوە کردووە. سەیید چەندی ساڵی پڕ نرخی تەمەنی لە خزمەتی شێخ ڕابواردبوو و لە هەموو کەسی لێ نیزیکتر بوو. دوای وەفاتی، تەنیا کەسێک بوو لە خانەقا بە گێڕانەوەی فەرمایشتەکانی شێخ، سەفا و ڕووحانییەتێکی تایبەتی دەدا بە کۆڕ و مەجلیسان و سەواسەرانی شێخی لەگەڵ تەریقەت و تەسەووف ئاشنا دەکرد. زۆر لەو زانا و پیاوە گەورانەی کە پێشتر بە خزمەتی شێخ نەگەیشتبوون و ئاشنایەتییان بە شێوە و شێواز و ڕێبازی تەریقەتەکەی نەبوو، هەر کە یەک دوو جار لە کۆڕ و مەجلیسی وەعز و پەند و ئامۆژگاری

سەیید دادەنیشتن، بە تەواوی بیروباوەڕ و ئەندێشە و هەست و هۆش و زەینی پێشوویان دەگۆڕا و دەچوونە ڕیزی مریدان و مەنسووبان و خۆشەویستانی شێخەوە.

سەیید کە چەندین ساڵ لە پڕ نرخترین تەمەنی خۆی لە خزمەت شێخدا ڕابواردبوو لە هەموو کەسی لێ نیزیکتر بوو دوای وەفاتی شێخیش سەرەنجام ئەم شاعیرە خواناس و ناسکخەیاڵ و ئەم بولبولە دەنگزوڵاڵ و خۆشئاوازەی گوڵزاری زانست و وێژە و ئەدەبی کوردی لە ساڵی «**١٣١٥**»ی هەتاوی «**١٩٣٦**»ی زایینی لەسەر بەرزایی لقوچڵی درەختی شکۆ و شانازییەوە بەرەو مەلەکوتی باڵا هەڵفڕی و کۆچی دوای کرد و لە تەنیشت ئارامگای هەمیشەیی شێخ بە خاک ئەسپێردرا. خوای پەروەردگار و بێ هاوتا بە بەزەیی بێ سنوور و بێ پایان و میهرەبانیی خۆی لەویش و لە هەموومان خۆش بێ.

**شیعر و غەزەلەکانی سەیید:**

«سەیید» لە ئامێزی حوجرە و مەدرەسە ئایینییەکانی مەهاباد و موکریان و کوردستاندا پێگەیشتووە و لە ژێر سێبەر و دەواری قوتابخانە و فێرگە ئەدەبییەکانی «نالی» و «سالم» و «کوردی» و «حەمدی» و «وەفایی» و «حەریق»دا نەشونمای کردووە. سەیید لەگەڵ ئەوەشدا کە لە ژێر دەواری شیعری کلاسیکی و عەرووزی پێشینیاندا پەروەردە ببوو، بەڵام بە ناوەرۆکی شیعر و غەزەل و ئەدەبی داهێنەرانە و تازە و نوێوە هاتە مەیدان و بەهرە و هونەر و زەوق و قەریحەی پڕا. هەر بۆیەشە دەبینین کە ناواخن و زمان و فەرهەنگ و تێگەیشتنی جیاواز تانوپۆی هەموو بەرهەمە شیعرییەکانی تەنیوە؛ واتا لە ڕوخسار و بەرگێکی کۆندا ناوەرۆک و مەبەستی تازە و نوێی داهێناوە.

«سەیید» شاعیرێکی هونەرمەند و بەهرەمەند بووە و جگە لە زمانی کوردی سۆرانی، بە سەر زمانەکانی فارسی و عەرەبی و تورکیدا زاڵ بووە و شارەزایی و ئاشنایەتی لەگەڵ زانست و ئەدەبی ئەو زمانانەش هەبووە و بە دوو زمانی کوردی و فارسی شیعری نووسیوە و بەرهەمی هەیە.

سەرلەبەری دیوانە بچووکەکەی نیشانەیەکی ئاشکرایە بۆ ڕادەی توانا و بلیمەتی و داهێنانی ئەو شاعیرە لە بوارەکانی زانست و زانیاریدا؛ بەتایبەت لە زانیاری ئایینی و دینی. لە مەیدانی غەزەل و پەخشاندا، شاعیر شوێنهەڵگر و لاسایی کەرەوەی شاعیرانی پێش خۆی نەبووە، بەڵکو شاعیرێکی داهێنەر و بەهرەمەند بووە و ناوەرۆکی بیر و ئەندێشە و خەیاڵ و شیعرەکانی تازە و نوێ و خاوەنی جیهانبینی و کەسایەتی تایبەتمەندی بەرهەم و شیعر و پەخشانەکانی خۆی بووە.

ڕاستە لە زۆر شوێنی شیعر و دیوانەکەیدا ئەوە بەدی دەکرێ کە لە ژێر ڕووناکایی ئاوێنەی شاعیرانی وەکو «نالی» و «سالم» و «کوردی» و «حەمدی» و «حەریق» و «وەفایی»دا شیعر و غەزەلەکانی خۆی داناوە و سێبەر و تارمایی ئەوانی بە سەرەوە دیارە، بەڵام لەوەشدا

وەکو شاعیرێکی داهێنەر و بەهرەمەند هەڵسوکەوتی کردووە و کەشوهەوا و داهێنان و جیهانبینی و تازەگەریی تایبەتی خۆی لە شیعر و پەخشانەکانیدا ڕەنگی داوەتەوە.

لە باری داهێنان و ناوەرۆک و مەبەستەکانی شیعرییەوە «سەیید» شاعیرێکی بەرزە و لە بوارەکانی شیعر و غەزەلی ئایینی و عیرفانی و دڵداری و خۆشەویستی و شادیشدا شیعری پتەو و بەهێزی داناوە و سەرلەبەری دیوانە کەم و بچووکەکەی پێ ڕازاندۆتەوە. لە باری ڕوخسار و شێوە و کێش و ئاوازەوە لە هەموو شیعرەکانیدا پێرەوی لە کێشی عەرووزی کردووە و لە بەشێکی هەڵبەستەکانیشدا ئاوڕی لە کێشی خۆماڵی کوردی داوەتەوە.

لە ڕووی سەروای شیعرییەوە، شاعیر بە گوێرەی نیزامی عەرووز لە زۆربەی چامە و غەزەل و مەسنەوی و چوارینە و دووبەیتییەکانیدا پیرەوی لە یەکێتی سەروا کردووە. هەر لە بواری ڕوخساری شیعرییەوە ئاوڕی لە هەموو جۆر و بەشەکانی هونەری ڕەوانبێژی وەکو ڕوونبێژی و جوانکاری و خۆشخوانی و واتاناسی داوەتەوە و لە نووسین و دانان و ڕازاندنەوەی شیعر و غەزەلەکانیدا بەهرەی لێوەرگرتوون.

ئەنجا وێنەی شیعری بە هەموو جۆرەکانییەوە ڕایەڵی تانوپۆی زۆربەی هەڵبەستەکانی نەخشاندووە و لەو لاشەوە قالبە شیعرییەکانی وەکو چامە و غەزەل و پێنجینە و تەرکیببەند و مەسنەوی و چواربەند و چوارینە و دووبەیتی فۆرم و شێوەی باوی هۆنراوەکانی پێکدەهێنن.

«سەیید» شاعیر و غەزەلوێژێکی داهێنەر و بەهرەمەندە و بیر و ئەندێشەقووڵ و ناسکخەیاڵە و خاوەنی تەعبیری هونەرمەندایە. شیعر و پەخشانەکانی جگە لەوەی بەرهەمی بیر و ئەندێشەی ورد و قووڵ و خەیاڵی ناسک و شاعیرانەیەتی، ئاوێنەی خوو و ڕەوشتە بەرز و جوانەکانیشێتی. هەر بەم هۆیەوە شیعر و پەخشانەکانی و بەتایبەت غەزەلە بەرز و جوان و دڵنشینەکانی هەر کام شاکارێکن و هەرگیز شکۆ و جوانی و درەوشاوەیی خۆیان لە دەست نادەن و دڵی

هەر خاوەن دڵی دەڕفێنن:

**تەشەککور واجبە بۆ من کە ئەمڕۆ مەزهەری یارم**
**بەبێ مەی مەست و مەسروورم بە خۆشی ڕەشکی ئەغیارم**
**ئەگەر حوبب و عەداوەت بوو، ئەگەر گریان و داوەت بوو**
**ئەگەر تاڵی و حەلاوەت بوو، بە شۆخی هاتە سەرزارم**
**شوکر شەهزادەیی ئەمجەد، سەمییی حەزرەتی ئەحمەد**
**گوزەشتی کرد لە نیك و بەد، کە زانی دڵ بریندارم**
**ئەگەر عاقڵ، ئەگەر شێتم، ئەگەر بۆزم، ئەگەر کوێتم**
**دەخیلی خاکی بەرپێتم، دەبێ سوورەت بدەی کارم**
**ئەگەرخوێریم، ئەگەرچاکم، ئەگەربەدخووم، ئەگەرپاکم**
**دەمێکە سەییدی فەتراکم، بە داوی تۆ گرفتارم**
**هەتا مانگی موحەرەم بوو، دەروونم پڕ لە ماتەم بوو**
**سەفەر ڕۆیی غەمم کەم بوو، دەڵێی سووکتر دەبێ بارم**
**هەتا ڕووی تۆم ببێ چاکم، گەش و ڕووخۆش و ڕووناکم**
**کە نار و هار و بێباکم، دەڵێی سەرمەستی دیدارم**
**بە دڵ مەستم، بە سەر پەستم، بە ئومێدی تۆ پابەستم**
**کە تۆ بێی دەست دەیە دەستم، دەڵێم خۆم شاهو خونکارم**
**غەریب و مات و مەدهۆشم، لە دەرکی تۆ نمەدپۆشم**
**منیش هەروەك سەمەد بۆشم، فەقەت تۆی یار و غەمخوارم**
**ئەتۆ ئینسان، ئەمن چاوم، ئەتۆ تەرلان، ئەمن داوم**
**لە تاو تۆ هێندە تەنگام، بە غایەت گەیوە ئازارم**
**وەرە «چاوەش» دڵت چابێ، ئومێدت هەر دوو دنیا بێ**
**تەمەننات هەر لە مەولا بێ، بە ئاسانی دەکا چارم**

شیعر و غەزەلەکانی «سەیید» بێجگە لەوەی خاوەنی بیر و ئەندێشەیەکی ورد و قووڵ و خەیاڵێکی ناسک و پڕ نێوەرۆک و سیحرئافەرین و پڕ لە هەست و سۆزی شاعیرانە و ئەویندارانەن، زۆر سادە و ڕەوان و زوڵاڵ و پڕ لە سۆز و عاتیفەشن. سەیید لە شیعر و غەزەلەکانیدا لە هونەری مۆسیقا سوود وەردەگرێ و جگە لە کێش و سەروای شیعر، بە شێوەیەکی کاریگەر لە هونەر و شتانێک بەهرە

وەردەگـرێ کە هەر کام بە جۆرێ مۆسیقای شیعر و غەزەلەکانی جوانتر و دڵنشینتر دەکەن. بەهرە وەرگرتن لە مۆسیقای شیعر بە شێوەیەکی هونەرمەندانە و زیرەکانە ئەنجام دەدا، بە چەشنێ کە خوێنەر و بیستیار بەر لەوەی سەرنج بداتە ڕەوانبێژی و خۆشخوانی و جوانکاری شیعر و غەزەلەکانی، شەیدای جوانی و دڵڕفێنی و دڵنشێنی و ناسکێتی و ڕێکوپێکی و هەست و سۆز و حاڵی شاعیرانە و ئەویندارانەی دەبـێ. سۆز و عاتیفەی شیعرەکانی و بەتایبەت غەزەلەکانی، دەڵێی شەکر و هەنگوینن لە نێو شەربەتێکی خۆش و شیریندا؛ بۆ ئەوەی خوێنەر و گوێدێر جگە لە خۆشی و شیرینی شتێکی تر نەخوێنێتەوە و نەخواتەوە:

**خۆت دەزانی من دەمێکە عەبد و خدمەتکاری تۆم**
**چاونەمین و دڵغەمین و خەستەوو بیماری تۆم**
**وەك گوڵی پەژموردەیی بێ ئاو لە بەر تاوی فیراق**
**چاوەڕێی موژدەی شەواو و نەشئەیی ئەسحاری تۆم**
**هەر وەکو مەیموون کە هەر چاوی لە داری لۆتییە**
**جوملە ئەعزام بۆتە چاو و سەرخۆشی دیداری تۆم**
**مەیلی من هەر مەیلی تۆیە، من لە تۆ هەر تۆم دەوێ**
**مات و حەیران و ئەسیر و زار و بێزیواری تۆم**
**مەتڵەبم عەفوە تکام بگرە بە حەققی پیری خۆت**
**عالەمێکم پێ ببەخشە چون سەگی دەربـاری تۆم**

شاعیر لە غەزەلە جوان و گەرم و ئاگراوییەکانیدا هەست و سۆز و ئارەزووی دیداری یاری هەیە کە پیر و مورشیدەکەی واتا شێخی بورهانە و هەموو گیانلەبەرێک لەبەر چاوی درەوشانەوەیەک لە بوونی ڕاستەقانی جیهانە. توانایی دووری نییە و بە دیتن و تەماشا کردنی هەر درەوشانەوەیەک لە جوانی مەست و شەیدا و بێخود دەبێ و هەر تەماشا کردن و سەیر کردنێک شاعیر لە جیهانێکەوە دەبا بۆ جیهانێکی تر. شیعر و غەزەلی سەیید هەست و سۆز و مەستی و شەیداییە و پڕە لە ڕووحی ژیان و ئەوین و خۆشەویستی:

**دەروونم پڕە لە دەرد و داغە قوربان**
**لە داغی تۆ دڵم ناساغە قوربان**
**لە بازاڕی ئەمەل شادی کەسادە**
**جەفا ڕەسمە، وەفا یاساغە قوربان**
**لە هەر لا غەم کە هەستا دێتە کن من**
**لە سایەی تۆ دڵم قۆناغە قوربان**
**گوڵی سووریی و گوڵزاری بەهاری**
**بەبێ دیداری تۆ ئالاغە قوربان**
**مژۆڵت خەنجەری کرمانە بۆ دڵ**
**بە خوێنی جەرگی من پەرداغە قوربان**
**دڵم بەندەرگەیە بۆ لەشکری غەم**
**لە خۆشی مەنعە ئەم تۆرپاغە قوربان**
**جەماڵت باغە تۆ خۆت باغەوانی**
**ئەمن بولبول ڕەقیبم زاغە قوربان**
**دەزانم بۆچی ناپرسی لە حاڵم**
**دڵی تۆ فاریغ و بێ داغە قوربان**
**کە دڵ گیرا بە تۆ ئارامی ڕۆیی**
**ئەوە دۆشاغە ئەم قاچاغە قوربان**
**دڵم دەرهات و خۆی ئاویتە بەر پێت**
**ئەوێستا بێ سەر و سۆراغە قوربان**
**ئەگەر ساغت دەوێ «چاوەش» غەریبە**
**بۆخۆی ناساغە، شیعری ساغە قوربان**

«سەیید» بێگومان یەکێک لەو شاعیرانەیە کە بە هۆی شێوە و شێوازی تایبەتی خۆی لە نووسین و دانانی شیعر و غەزەلدا زۆر گرینگە و گرنگییەکەشی لەوە دایە کە مەبەست و نێوەرۆک و ناسکخەیاڵی و ناسکدڵی خۆی بە زمانێکی زۆر سادە و ڕەوان و زوڵاڵ دەردەبڕێ:

چ خۆشە من کە غەمبارم ئەتۆش مەشغوولی بارم بی
بە هەر کارێ کە تێکەوتم بە دڵ سەروەقتی کارم بی
بلا من خەستە و زار و مەلوول و بێ قەراریش بم
سەلیم و ساغ و سەرخۆشم کە تۆ سەردار و یارم بی
ئەگەر نۆکەر لە ئاغای خۆی ئەمین بێ قەت لە دەست ناچێ
دەڵێم شاهەنشەهم قوربان ئەگەر تۆ شەهریارم بی
دەڵێن دڵ ڕێی هەیە بۆ دڵ کە دوو کەس یار و هەمدەم بن
کە من بێ سەبر و ئارامم دەبێ تۆش بێ قەرارم بی
وجوودم وەك ئەبووجەهلە لە دەستی ڕادەکەم قوربان
بە شەرتێ تۆ وەکو سددیق ڕەفیق و یاری غارم بی
دەمێکە من بە تۆ مەسروور و پشتئەستوور و ڕووسوورم
دەبێ لێرە و دوواش وەك پار و پێرار غەمگوسارم بی
دەزانی من بەچی مـردووم تکام بگرە بلا نەمرم
بلێ «چاوەش» بە تۆم بەخشێ بە شەرتێ جاننیسارم بی

«سەیید» شاعیرێکی ناسکخەیاڵە و هەمیشە بە شوێن مەبەست و نێوەرۆکی تازە و داهێنەرانەدا دەگـەڕێ و یەکێک لە مەبەستە گرینگەکانی شیعری سەیید ئەوەیە کە وەکـو هەموو شاعیرێکی ناسکخەیاڵ و بیر و ئەندێشە قـووڵ، خـاوەنی زاراوەی تایبەتی خۆیەتی، واتا زاراوەی تازە و نوێ بە شێوەیەکی داهێنەرانە بۆ دەربڕینی هەست و سۆز و ئەوین و خۆشەویستی و تێکگەیشتن و تەمەن و ژیان و جودایی. یا بۆ مەبەستە ناسک و باریکەکانی عیرفانی و مەعنەوی وەک پێوەندی ئادەمیزاد لەگەڵ خوا و پەیامبەر و پیر و مورشیدەکەی جۆرێک تەعبیر و دەربرینی شاعیرانەی خۆی هەیە و لە بیر و ئەندێشەیەکی تایبەتی وەرگرتووە. بە تێکرایی هەر وەکو گوتمان سەیید لە ڕستەی سادە و ڕەوان، شیعری بەرز و پڕ مانا و غەزەلی خاوەن بیر و ئەندێشەی قووڵ و پڕ لەهەست و سۆز و جۆش و خرۆش و گەرم و ئاگراوی و شاعیرانەی داناوە:

**مووددەتێکە من کە غەمبارم ئەتۆ غەمخوارمی**
**بـــاغـــەوانی باغی تـــۆم و تۆ گوڵی گوڵزارمی**
**من مەتاعێکی کەسادم، بێ ڕەواج و ڕەونەقم**
**دەست دە قوڵم بگرە هەر تۆ ڕەونەقی بازارمی**
**بێکەسم کەوتووم دەڵێی کۆنە حەسیری مەنزڵم**
**ساحێب و مەولا و ئەمیرم تۆی و هەر تۆ یارمی**
**پێم بڵێ قوربان بە حەققی مەرقەدی پیری مونیر**
**من کە دڵـــدادەم بە تۆ تۆش یـــاوەر و دڵدارمی**
**وەسفی تۆ بۆتە بژێوم «چـــاوەش»م مەنعم مەکە**
**ئۆممەتێکی سەربەخۆم تۆ ئەحمەدی موختارمی**

«سەیید» لە شیعرەکانیدا عیشق و عیرفان و بابەت و مەبەستی عارفانە و عاشقانە و سۆفیانەی تێکەڵ کـردووە و نێوەرۆکی شیعرەکانی و بەتایبەت غەزەلەکانی تازە و نوێن و ڕووح و گیانێکی شاد و زیندوویان هەیە، «سەیید» شاعیرانی پێش خۆی وەکو نالی و سالم و کوردی و حەمدی و مەحوی و وەفایی و حەریق بە تەواوی کاریان تێکردووە و لە شیعر و غەزەل و داهێنانی ئەوان لەباری زمان و بیر و ئەندێشە و خەیاڵەوە بەهرەی وەرگرتووە، وەکو هەنگ شیلەی گوڵانی لە گوڵزاری پڕ لە گوڵ و عەتری ئەم شاعیرانە هەڵمژیوە و لە شیلەی هەر گوڵێک چێشتوویەتی و بە هەنگوینی پێی بەخشیوینەوە، وەک ئەم چواربەندی خوارەوە کە شاکارێکی بەرزە:

**ئـــەی نـــەوجـــەوانی پـــڕ کـــەیـد و حیلە**
**وەســـڵـــت شـــفـــایـــە دەوای عـــەلـیـلـە**
**دووریـــــت جـــەفـــایـــە دڵ پـــێـــی قەتیلە**
**ئـــەم زەمـــهـــەریـــرە ئـــەو سەلـسەبیلـە**

* * *

**بـــۆ غـــەیـــرە ئـــاوی بـــۆ ئـێـمـە خـوێـنـی**
**بـــۆ خـەڵـکـی لـوتـفـی بـــۆ ئـێـمـە جـوێـنـی**
**عـــاشـــق بـــەزێـــن و ڕەقـــیـــبڕفـــێـــنی**
**تـــۆ بـــەفـــر و خـــوێـــنی ڕووت ئـــاوی نیلە**

* * *

دیدارت مەنعە، ویسالە فەقدە
ئەندووهە جەمعە هیجرانە نەقدە
نە ساخی وەعد و فەساخی عەقدە
نە قازی عەهدە ئەو بێ دەلیلە

* * *

وەفا دەڵێی کەم جەفاتە زۆرە
حەیاتە تەڵخە سەفاتە شۆرە
بێچارە «چاوەش» پاشی کلۆرە
نێورانی مۆرە وەك کرمی پیلە

* * *

باران دەبارێ دڵ بێ سەدایە
جانانە دوور و بێ ئیعتینایە
سەفا بە سەر چوو نۆبەی جەفایە
کەوای سپی دڵ بەدبەختی قیلە

* * *

دڵ ڕووت و قووتە هەر ڕووتە قووتی
دەروون زەمینە زمانە جووتی
زەرعی خەیاڵە هیجرانە کووتی
میحنەت عەیالە و «چاوەش» موعیلە

* * *

دڵ مات و دەرهەم سەرکاس و گێژە
ڕێی دوور و تاریك باریك و لێژە
عەمەل کەم و کول ئەمەل درێژە
فالروح بق والنفس فیلە

* * *

یەکێ دەبینی بێباك و شۆخە
لە ڕێی چنینی هەنار و کۆخە
لە لایێ دەبیەی هەر کۆخە کۆخە
هەر ئاخ و ئۆخی خەستە و عەلیلە

* * *

عوسرەت بە پێی سەگ عیشرەت قەلیلە
ڕەحمەت دەڵێی کەم زەحمەت سەبیلە
من ماتی ماتم زبان کلیلە
عالەم سەراسەر هەر قال و قیلە

* * *

بۆ من عەزیزم هەر داخ و دەردی
بۆ ماسیوای من تۆ تازەوەردی
بۆ خەڵکی سووری بۆ ئێمە زەردی
بۆ خەڵکی مشکی بۆ مەش پشیلە

* * *

ڕەقیب وەکو سەگ خەریکی کۆخە
پیشەی وەڕینە خۆراکی پۆخە
مەحبووبی وەك تۆ دایم لە ڕووخە
دڵدارە شۆخە «چاوەش» زەلیلە

شیعر و غەزەلی سەیید پڕ لە هەست و سۆز و جۆش و خرۆشی شاعیرانە و جوان و دڵنشین و هەستبزوێنن، لە زۆربەی غەزەلەکانیدا هەست و سۆز و حاڵ و خەیاڵی ناسکی شاعیرانە لەگەڵ سادەیی و ڕەوانی و زوڵاڵی و شەو و ڕستەدا تێکەڵاوە. شیعری «سەیید» گەرم و ئاگری و دڵ و گیانسووتێنەرە، بەتایبەت لە غەزەلەکانیدا مەست و بێخود و شەیدایە. هەر چەند شیعر و غەزەلەکانی کەمن، بەڵام پڕن لە بیر و ئەندێشەی ورد و قووڵ و خەیاڵی ناسک و هەست و سۆز و جۆش و خرۆش و حاڵی شاعیرانە و گەرم و ئاگراوین و لەو پەڕی جوانی و دڵڕفێنی و دڵنشینی دان و ڕووح و گیانی غەزەلن:

غەریب و بێکەس و داماوم ئەمشۆ
لە زیندانی غەمەتدا ماوم ئەمشۆ
وەکو پەروانەیی خاڵت عەزیزم
لە سەر شەمعی ڕوخت سووتاوم ئەمشۆ
لە داغی خاڵی تۆ ڕیشەی وجوودی

بــه دووخـــی غــەم فــەلــەك بـــاداوم ئەمشۆ
وەکـــو زولــفــت کــە وا ســـەودایـــی ڕووتـــە
بــە شــێــوەی ئــەو منیش شــێــواوم ئەمشۆ
ڕەقــیــب زانی غــەریــبی کــۆی نــیگــارم
وەکـــو ســـەگ بــۆیــە دەورەی داوم ئەمشۆ
کــە دیــتــم چــاوەکــەت زانــیــم کــە مەستە
لــەبــەر چـــاوت بــە دڵ بـــــرژاوم ئەمشۆ
بــە داوی زولــف و دانـــەی خاڵی ســەر ڕووت
فــریــوی مــورغـــی ڕووحـــــت داوم ئەمشۆ
بــلا خــاکـی هــەمــوو عــالــەم وەســـــەر کـەم
کــە یـــارم ڕووی لــێوەرگــێــراوم ئەمشۆ
گــرفــتــاری عــــەزابی ئــەشــك و ئــاهــم
دەمــێ غــەرقــم، دەمـــێ ســـووتـــاوم ئەمشۆ
لــەبــەر چـــاوم زەلی دەور و کــەنــارم
لــە زەلــکـــاوی غــەمــا خــنــکــاوم ئەمشۆ
فـــیراقـــت ئـــاشـــەوان و ئــاسمـــان ئــاش
بــە نــۆ بــەرداشـــی زل هـــاڕاوم ئەمشۆ
ئــەگــەرچــی شــێــری بێشیەی مەشقی عیشقم
بــە عــیــشــوەی ئــاهــووێ گـــیراوم ئەمشۆ
بــە ســـانی پــەرچــەمــی ئــاڵــۆز و خـــاوت
دڵـــم ئـــاڵـــۆزە بـــێ تـــۆ خـــاوم ئــەمــشــۆ
لــە دووری تــۆ فــەلــەك وای دا بــە سەرما
کــەڕ و کــوێــرو هــوڕ و تـــاســاوم ئەمشۆ
لــە چـــاوم دای و چـــاوم پــڕ لــە ئــاوە
وەرە ئـــەی گــوڵــبــنی تــێــرئــاوم ئەمشۆ
کـــە تـــۆ ڕۆیـــــی دڵـــم گـــیرا نــەهــاتم
لــە گــیــانی خــۆم و دڵ تـــۆراوم ئەمشۆ
بــە تـــیری غــەمــزە جــەرگــت پـــارە کــردم
ئــەســیری غــەمــزە، دیــلــی چـــاوم ئەمشۆ

**بە نووکی تیری موژگانت شەهیدم**
**بەبێ نام و نیشان کوژراوم ئەمشۆ**
**دەزانم چونکە بۆ تۆ بوومە «چاوەش»**
**لە بۆیە وات لە بەر بێزراوم ئەمشۆ**

ئەم غەزەلە جوان و دڵنشینەی سەیید هەست و سۆز و ڕەوانی و زولاڵی تێدا شەپۆل دەدا و وەکو چپە و چرپەی جۆبار پڕە لە جوانی و دڵڕفێنی و هەستبزوێنی. «سەیید» لە شیعر و غەزەلەکانیدا هەمیشە ڕووی دڵی لە پیر و مورشیدەکەیەتی و خەریکی گفتوگۆ کردن و ستایش کردنیەتی و بە هەست و سۆزی شاعیرانەوە خۆش ویستن و خۆشەویستی خۆی سەبارەت بەم پیرە پیرۆزە، کە شێخ یوسفی بورهانە، دەربڕیوە:

**بێ کە بێ تۆ بێ نموونەی ڕەنگمە**
**دڵ دەفە، سەر سازە، سینەم چەنگمە**
**من حەیاتم تۆی، حەیاتم تۆ کە چووی**
**من لە ژینی خۆم هەراسم نەنگمە**
**وەسڵی تۆ تریاکە بۆ من فێری بووم**
**گێژی دووریم و فیراقت بەنگمە**
**تۆ کە ڕۆیی من نەمردم وەی لە من**
**دائیمەن ئێستێ لەگەڵ خۆم جەنگمە**
**هێند لە دووری تۆ سەری خۆم دا لە سەنگ**
**سەنگ نەما، بۆ سینە سەنگم چەنگمە**
**هەر کەسێ پەروانەیی شەمعێکە، من**
**بولبولم گوڵ یاری شۆخ و شەنگمە**
**«چاوەش»م سینەم دەهۆڵە لێی دەدەم**
**ئاسمان حەیرانی سەیحە و دەنگمە**

دووبەیتی و چوارینەکانی سەییدیش هەر کام بە نۆبەی خۆیان بەرز و پڕ نێوەرۆک و جوان و ناسکن و لە هەندێ وشە و ڕستەی ڕەوان و سادە نێوەرۆک و مەبەستی زۆر جوان و دڵنشین و هەستبزوێنی بەدیهێناوە:

**چوومە جەرگەی ئەهلی دڵ، جەرگێکی بێ داغم نەدی**
**ناڵەیی بولبول لە باغا بێ قـڕەی زاغـم نەدی**
**عالەمێکم دی بە ناساغی، یەکی ساغم نەدی**
**دوور لە مـەردانی خودا غەیری قورمساغم نەدی**

شـاعـیری پـایـەبـەرز و بـەنـاوبـانـگ و خـەیـاڵ ناسکی کـورد خوالێخۆشبوو عەبدوڵلابەگی میسباحوددیوان «ئەدەب» ئەم دوو بەیتییەی خوارەوەی لە وەڵامی ئەم دوو بەیتییەی سەیید ڕەشیددا نووسیوە و بۆی ناردووە:

**ئەهلی دڵ دڵ داغـــدارن بۆیە بێ داغـت نەدی**
**بولبولی ئەو باغە نی تۆ، بۆیە بێ زاغت نەدی**
**تۆ میزاجی خۆت نەساغە پێت نەزانیوە «سەیید»**
**بۆیە لـەو دنیایەدا غەیری قورمساغت نەدی**

* * *

**نەفیی ئەربابی تەشەییوخ شەرتە بۆ تەسدیقی پیر**
**«لااله» بووە سەبەب «الا» کە «الله»ی کەوتە گیر**
**«لا» ئیلاهی برد و «الا» کەوتە سەر ئیسباتی «هو»**
**ئەم بە «الا» ئەو بە «لا»، ئەو کەوتە گیر ئەم چوو لە بیر**

* * *

**جێژنی قوربانە وەرە تا خۆم بە قوربانت بکەم**
**بەم دوو چـاوە ئابیاری سـەروی بوستانت بکەم**
**بۆ هیلالی عیدی قوربانی بـرۆت سـەر هەڵبڕم**
**خۆم نیشانەی تیری تورکی چاوی فەتتانت بکەم**

* * *

**وەرە ئەی مەهی دوو هەفتە کە لە قامەتت بڕاوم**
**لە قییامەتت بترسە بە خـودا دەکـەویـە داوم**
**مەڵێ بۆ نەمردی «چاوەش» کە لە من بڕای حەیاتم**
**کە ئەمەت لە کن حەیاتە بە ئومێدی وەسڵە ماوم**

کاتێ کە «سەیید ڕەشید» لە خوێندنگای ئایینی «مزگەوتی ڕۆستەمبەگ»ی مەهاباد لە لای خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا حوسێنی سەقزی دەخوێنێ، بە میرزا حاجی قادری مەهابادی، کە یەکێک لە تاجران و بازرگانانی بەناوبانگی مەهاباد بووە، دەڵێ: تکایە حاجی کە چوویە «مەسکەو» ساعەتێکی جوان و چاکم بۆ بێنە، بە هەڵکەوت مەلا عەزیزی مفتی سەقزیش کە دۆست و هاوڕێی سەیید ڕەشید بووە، هەر ئەو داوایەی لە میرزاحاجی کردبوو، میرزاحاجی دوای گەڕانەوە لە مەسکەو دوو ساعەتی بۆ هێنابوون، یەکی قاپسپی و یەکی قاپڕەش، سەیید ڕەشید پێی خۆش دەبێ کە ساعەتە قاپسپییەکە بۆ وی بێ، بەڵام لە کاتی دابەش کردنی ساعەتەکان بەپێچەوانەی ئارەزوو و مەیلی سەیید ڕەشید ساعەتە قاپڕەشەکەی بە نەسیب دەبێ، هەر بەم هۆیەوە ئەم دووبەیتییەی خوارەوە دەنووسێ و بۆ کاکی سەقزی دەنێرێ:

**بابە حاجی کە سەرم بێ بە فیدای چاوی گەشی**
**دوو ساعەتی هێنابوو بەبێ غەللوغەشی**
**ئەمن و کاکی سەقزی هەر یەکە دەستێکمان برد**
**کەچی ئی وی بە سپی هاتە دەر، ئی من بە ڕەشی**

سەیید ڕەشید ئەم دووبەیتییەی خوارەوەی بۆ خوالێخۆشبوو حاجی میرزا قادر نووسیوە، وەک دەڵێن لەو سەردەمەدا، کە نیزیک بە جەنگی جیهانی یەکەم بووە، سەیید ڕەشید ویستوویەتی ژن بێنێ:

**ئەمن ڕووت و ئەتۆ ساحێب فلووسی**
**غەمی دنیا لە قەلبی خۆت دەنووسی**
**ئەتۆ دەربەستی سالاّتی عرووسی**
**ئەمن سەرمەستی حالاّتی عەرووسی**

دوو بنەماڵە لە ناوچەی لاجان کێشە و نێوانناخۆشییان لێ پەیدا دەبێ و یەکێک لەو بنەماڵانە بە «یەعقووبی» بەناوبانگ بووە. یەکێک لە ئەندامانی بنەماڵەکەی تر کە لە مەنسووبانی شێخ یوسف

شەمسەددین و ناوی یوسف بووە پەنا دەبا بۆ سەییدڕەشید لە گوندی «خانەقا» و دەچێتە لای و تکا و ڕەجا و داوای لێدەکا کە نامەیەک بۆ «پیرۆتئاغا»ی کوڕی «محەمەدئاغا»ی مامەش بنووسێ و داوای لێ بکا لەو نێوانناخۆشییەدا لایەنگری و پشتیووانی لەوان بکا و یارمەتییان بدا و ئەم کێشە و نێوانناخۆشییەیان لە نێواندا نەهێڵێ و ئاشتیان بکاتەوە، سەیید ڕەشیدیش ئەم دووبەیتییە بۆ پیرۆت ئاغا دەنووسێ و بۆی دەنێرێ:

**زاهـیرەن فەرمووتە من سـەردارم و خـاوەن بەشم**
**گـیرودارم پێدەوێ چـون شێرەکوللەی مامەشم**
**لانی «یوسف» بەرمەدە بۆ خەرگەلی «یەعقووبی»یان**
**بەردەدەی بە گونم، چ کێرم پێدەچێ من «چاوەش»م**

واتە: لانی «یوسف» ئەم پیاوە هەژار و نەدار و بەستەزمان و بێدەرەتانە بەرمەدە و زوڵمی لێ مەکە بۆ بنەماڵەی زاڵم و ستەمکار و ساماندار و دەوڵەمەندی «یەعقووبی»یان، هەروەها ئیشارە و هێماشە بۆ شێخ یوسف «شێخی بورهان»، واتە ئەگەر لانی یوسف ئەم پیاوە هەژار و نەدار و بێ دەسەڵات و بێ دەرەتانە بەربدەی و لانی بنەماڵەی «یەعقووبی» بگری، شێخ یوسف پێی ناخۆش دەبێ و دڵی لێت دێشێ و لە بەر چاوی خوا و خەڵک و شێخ سووک و بێ ڕێز و شەرمەسار دەبی، هەروەها ئیشارە و هێماشە بۆ چیرۆکی حەزرەتی یوسفی کوڕی حەزرەتی یەعقووب پێغەمبەر و کوڕەکانی کە زوڵمیان لە یوسف پێغەمبەری برایان کرد و لە چاڵاویان هاویشت.

مەلا مەعروفی ئەعرەج کە پێیان گوتووە «مەلا مارفە شەلە» بەرپرس و بەڕێوەبەری نانەواخانە و جیرەنانی خانەقا و بڵاو کردنەوەی لە نێو سالیکان و مریدان و مەنسووباندا بووە و لاوێکیش یارمەتی داوە، جارێکیان جیرە نانەکەی سەیید ڕەشید درەنگ دەنێرێ و سەیید ڕەشیدیش ئەم چوارینەی خوارەوە دادەنێ و بۆ مەلا مارفە شەلەی دەنێرێ:

**ئـەتـۆ سـستی ڕەفـیـقـت ئـەسـپـی خـۆشـرەو**
**ئـەتـۆ بـێـداری ئـەو کـەروێـشـکـی خـۆشخـەو**
**وەزیـــفـــەم جـیرەنـانـێـکـە بـە گـەرمـی**
**ئـەگـەر زوو پێم نـەدەی تـۆ دەچـمـە زگ ئەو**

مەلا مارفە شەلە، بە شیعرەکەی سەیید ڕەشید زۆر تووڕە و قەڵس و دڵگران دەبێ و دەڵێ: جیرەنانەکەی لێ دەبڕم و ئیدی بۆی نانێرم، کاتێ ئەم قسەیە بە سەیید ڕەشید دەگاتەوە بە ناوی مەعزەرەت هێنانەوە و پەشیمانیی دیسان ئەم چوارینەیەی خوارەوە دەنووسێ و بۆی دەنێرێ:

**ئـەرێ مـەعـرووفی ئـەعـرەج پـیری مـەکـرۆ**
**وەزیـــفـــەم جـیرە نـانـێـکـە بـەبـێ دۆ**
**لـەوەی تـووڕەی گـتـوومـە دەچـمـە زگ ئەو**
**پـەشـیـمـانم، لـەوەی پـاش دێـمـە زگ تۆ**

ڕۆژێکیان مەلا مارفە شەلە، لەگەڵ پشیلەیەکی تایبەتی خۆی بەرەو باغێکی نزیک «خانەقا» دەچێ و سەیید ڕەشید دیسانیش ئەم چوارینەی خوارەوەی بۆ دەنووسێ و بۆی دەنێرێ:

**پشیلەی کـەوتـە دوو بـۆ سـیـاحـەتی بـاغ**
**پـشـیـلـە کـلـکـی لـێ کـردۆتـە بـەیـداغ**
**ئـەبـوو هـیـرڕەی زەمـانـی ئـێـمـە خـۆتی**
**حمـاك الله فی الـداریـن چـۆلاغ**

شێخ محەمەدی کوڕی شێخ یوسفی بورهان گێڕاویەتەوە و گوتوویەتی: جارێک لە دێی «شەرەفکەند» ژنان دەوەیان دەکێشا، منیش منداڵ بووم و لەگەڵ ئەوان هاتوچۆم دەکرد و جارجاریش یارمەتیم دەدان. سەیید ڕەشید لە دوورەوە چاوی بە من کەوت، بانگی کردم و فەرمووی شێخ محەمەد ئەوە چ دەکەی؟ عەرزم کرد: قوربان لەگەڵ ژنان خەریکی دەوە کێشانم، فەرمووی باشە بەلاّم ئەو

کاره بێ زەمزمه نابێ، ئەگەر گەڕایەوە بچۆ ئەو شیعرانه لەبەر کەو
بە گۆرانی بیانڵێ:

**من به مەسەل دەروێشم — موغتەنیمی بڕوێشم**
**نایبی کەرقەڵیشم — مودخیلی پاش و پێشم**
**هەشتێکی بێته پێشم — لاڕەددە تێی دەکێشم**
**ئەمڕۆ دەوەی دەکێشم — سبەی دە وەی دەکێشم**

**سجیللی نەفسی ئەمماره بەرازه**
**دزه، حیزه، خەریکی تورکتازه**
**له تاعەتدا کە نەتبێ لوبسی تازه**
**بە بالاپۆشی «کرمنا» مەناز**

## سەرمەستی دیدار

تەشەککور واجبە بۆ من کە ئەمڕۆ مـەزهـەری یارم
بەبێ مەی مەست و مەسروورم، بە خۆشی ڕەشکی ئەغیارم
ئەگەر حوبب و عەداوەت بوو، ئەگەر گریان و داوەت بوو
ئەگەر تاڵی و حـەلاوەت بوو، بە شۆخی هاتە سەرزارم
شوکر شەهزادەیی ئەمجەد، سەمییی حـەزرەتی ئەحمەد
گوزەشتی کرد لە نیك و بـەد، کە زانی دڵ بریندارم
ئەگەر عاقڵ، ئەگەر شێتم، ئەگەر بۆزم، ئەگەر کوێتم
دەخیلی خاکی بەر پێتم، دەبـێ سـووڕەت بـدەی کارم
ئەگەر خوێڕیم، ئەگەر چاکم، ئەگەر بەدخووم، ئەگەر پاکم
دەمێکە سەییدی فەتڕاکم، بە داوی تۆ گرفتارم
هەتا مانگی موحەڕڕەم بوو، دەروونم پڕ لە ماتەم بوو
سەفەر ڕۆیی غەمم کە بوو، دەڵێی سووکتر دەبێ بارم
هەتا ڕووی تۆم ببێ چاکم، گەش و ڕووخۆش و ڕووناکم
کە نـار و هـار و بێباکم، دەڵێی سەرمەستی دیـدارم
بە دڵ مەستم بەسەر پەستم، بە ئوممێدی تۆ پابەستم
کە تۆ بێی دەست دەیە دەستم، دەڵێم خۆم شاهـ و خونکارم
غەریب و مات و مەدهۆشم، لە دەرکـی تۆ نمەدپۆشم
منیش هەر وەك سەمەد بۆشم، فەقەت تۆی یار و غەمخوارم
ئەتۆ ئینسان ئەمن چـاوم، ئەتۆ تـەڕلان ئەمن داوم
لە تاو تۆ هێندە تەنگام، بەغایەت گەیوە ئـازارم

## جان نیسار

چ خۆشه من که غەمبارم ئەتۆش مەشغوڵی بــارم بی
به هەر کارێ که تێکەوتم به دڵ سەروەقتی کارم بی
بڵا من خەستەوو زار و مەلوول و بێ قــەراریــش بم
سەلیم و ساغ و سەرخۆشم که تۆ ســەردار و یــارم بی
ئەگەر نۆکەر له ئاغای خۆی ئەمین بێ قەت له دەس ناچێ
دەڵێم شاهەنشەهم قوربان ئەگەر تۆ شەهریارم بی
دەڵێن دڵ ڕێی هەیه بۆ دڵ که دوو کەس یار و هەمدەم بن
که من بێ سەبر و ئارامم دەبــێ تۆش بێ قــەرارم بی
وجــوودم وەك ئەبووجەهله له دەستی ڕادەکــەم قوربان
به شەرتێ تۆ وەکــو سدیق ڕەفیق و یــاری غــارم بی
دەمێکه من به تۆ مەسروور و پشتئەستوور و ڕووسوورم
دەبێ لێرەو دوواش وەك پار و پێرار غەمگوسارم بی
دەزانی من به چی مــــردووم تکام بگره بڵا نەمرم
بڵێ «چاوەش» به تۆم بەخشێ به شەرتێ جاننیسارم بی

# مەشقی عیشق

غەریب و بێکەس و داماوم ئەمشۆ
لە زیندانی غەمەتدا ماوم ئەمشۆ
وەکو پەروانەیی خاڵت عەزیزم
لە سەر شەمعی ڕوخت سووتاوم ئەمشۆ
لە داغی خاڵی تۆ ڕیشەی وجوودی
بە دووخی غەم فەلەك باداوم ئەمشۆ
وەکو زولفت کە وا سەودایی ڕووتە
بە شێوەی ئەو منیش شێواوم ئەمشۆ
ڕەقیب زانی غەریبی کۆی نیگارم
وەکو سەگ بۆیە دەورەی داوم ئەمشۆ
کە دیتم چاوەکەت زانیم کە مەستە
لەبەر چاوت بە دڵ برژاوم ئەمشۆ
بە داوی زولف و دانەی خاڵی سەر ڕووت
فریوی مورغی ڕووحت داوم ئەمشۆ
بلا خاکی هەموو عالەم وەسەر کەم
کە یارم ڕووی لێوەرگێراوم ئەمشۆ
گرفتاری عەزابی ئەشك و ئاهم
دەمێ غەرقم، دەمێ سووتاوم ئەمشۆ
لەبەر چاوم زەلی دەور و کەنارم
لە زەلکاوی غەما خنکاوم ئەمشۆ
فیراقت ئاشەوان و ئاسمان ئاش
بە نۆ بەرداشی زل هاڕاوم ئەمشۆ
ئەگەرچی شێری بێشیەی مەشقی عیشقم
بە عیشوەی ئاهووێ گیراوم ئەمشۆ

بە سانی پەرچەمی ئاڵۆز و خاوت
دڵم ئاڵۆزە بێ تۆ، خاوم ئەمشۆ
لە دووری تۆ فەلەك وای دا بە سەرما
کەڕ و کوێر و هوڕ و تاساوم ئەمشۆ
لە چاوم دای و چاوم پڕ لە ئاوە
وەرە ئەی گوڵبنی تێرئاوم ئەمشۆ
کە تۆ ڕۆیی دڵم گیرا نەهاتم
لە گیانی خۆم بە دڵ تۆراوم ئەمشۆ
بە تیری غەمزە جەرگت پارە کردم
ئەسیری غەمزە، دیلی چاوم ئەمشۆ
بە نووکی تیری موژگانت شەهیدم
بەبێ نام و نیشان کوژراوم ئەمشۆ
دەزانم چونکە بۆ تۆ بوومە «چاوەش»
لە بۆیە وات لە بەر بێزراوم ئەمشۆ

# گوڵزاری بەهار

دەروونم پڕ لە دەرد و داغە قوربان
لە داغی تۆ دڵم ناساغە قوربان
لە بازاڕی ئەمەل شادی کەسادە
جەفا ڕەسمە، وەفا یا ساغە قوربان
لە هەر لا غەم کە هەستا دێتە کن من
لە سایەی تۆ دڵم قۆناغە قوربان
گوڵی سووریی و گوڵزاری بەهاری
بەبێ دیداری تۆ ئالاغە قوربان
مژۆڵت خەنجەری کرمانە بۆ دڵ
بە خوێنی جەرگی من پەرداغە قوربان
دڵم بەندەرگەیە بۆ لەشکری غەم
لە خۆشی مەنعە ئەم تۆرپاغە قوربان
جەماڵت باغە تۆ خۆت باغەوانی
ئەمن بولبول ڕەقیبم زاغە قوربان
دەزانم بۆچی ناپرسی لە حاڵم
دڵی تۆ فاریغ و بێ داغە قوربان
کە دڵ گیرا بە تۆ ئارامی ڕۆیی
ئەوە دۆشاغە ئەم قاچاغە قوربان
دڵم دەرهات و خۆی ئاویتە بەر پێت
ئەوێستا بێ سەر و سۆراغە قوربان
ئەگەر ساغت دەوێ «چاوەش» غەریبە
بۆخۆی ناساغە، شیعری ساغە قوربان

# بەفر و خوێن

ئەی نەوجەوانی پڕ کەید و حیلە — وەسڵت شفایە، دەوای عەلیلە
دووریت جەفایە، دڵ پێی قەتیلە — ئەم زەمهەریرە، ئەو سەلسەبیلە

بۆ غەیرە ئاوی، بۆ ئێمە خوێنی — بۆ خەڵکی لوتفی، بۆ ئێمە جوێنی
عاشقبەزێن و ڕەقیبڕفێنی — تۆ بەفر و خوێنی، ڕووت ئاوی نیلە

دیدارت مەنعە، ویساله فەقدە — ئەندووهە جەمعە، هیجرانە نەقدە
نەساخی وەعد و فەساخی عەقدە — نە قازی عەهدە ئەو بێ دەلیلە

وەفا دەڵێی کەم، جەفاتە زۆرە — حەیاتە تەڵخە، سەفاتە شۆرە
بێچارە «چاوەش» پاشی کلۆرە — نێوڕانی مۆرە وەك کرمی پیلە

باران دەبارێ دڵ بێ سەدایە — جانانە دوور و بێ ئیمتینایە
سەفا بە سەر چوو نۆبەی جەفایە — کەوای سپی دڵ بەدبەختی قیلە

دڵ ڕووت و قووتە هەر ڕووتە قووتی — دەروون زەمینە زمانە جووتی
زەرعی خەیاڵە هیجرانە کووتی — میحنەت عەیالەو «چاوەش» موعیلە

دڵ مات و دەرهەم، سەرکاس و گێژە — ڕێی دوور و تاریك باریك و لێژە
عەمەل کەم و کول ئەمەل درێژە — فالروح بق والنفس فیلە

یەکێ دەبینی بێ باك و شۆخە — لە ڕێی چنینی هەنار و کۆخە
لە لایی دەبییەی هەر کۆخە کۆخە — هەر ئاخ و ئۆخی خەستە و عەلیلە

عوسرەت بە پێی سەگ، عیشرەت قەلیلە      ڕەحمەت دەڵێی کەم، زەحمەت سەبیلە
من ماتی ماتم زبان کلیلە      عالەم سەراسەر هەر قال و قیلە

بۆ من عەزیزم هەر داخ و دەردی      بۆ ماسیوای من تۆ تازەوەردی
بۆ خەڵکی سووری، بۆ ئێمە زەردی      بۆ خەڵکی مشکی بۆ مەش پشیلە

ڕەقیب وەکو سەگ خەریکی کۆخە      پیشەی وەڕینە خۆراکی پۆخە
مەحبووبی وەك تۆ داییم لە ڕۆخە      دڵدارە شۆخە، «چاوەش» زەلیلە

# شۆخی یەگانە

ئەمن ڕوو زەردم ئەی شۆخی یەگانە
نەڕەنجانم لە نارنجم عەیانە
دڵم لەتلەت بووە دەستم بڕاوە
بە «ماهذا بشر» بارم گرانە
ئەمن لادەم لە تۆ سەد حاشەلیللا
عەزیزم جووی مەکە عوزر و بەهانە
بەبێ ئینسافی ڕووم لێوەرمەگێڕە
وەرە ئەمڕۆ مەقامی ئیمتیحانە
وەکو کوردان دەڵێن: لە زوێڵە چەرمە
دەخیلت بم مەبە پەندی زەمانە
ئەمن تۆم پێدەوێ دایکم فیدات بێ
«گێچی تۆز ئێلەمیش» بێ، بێ بەهانە
وەرە تۆو یوسفی میسری مەلاحەت
گوڵی مەجلیس بە بۆ ئەم چەند شەوانە
ئەمن ڕووزەرد و شەرمەندەم، ببەخشە
ئەمەش نارنجە ناردم بۆ نیشانە
کە «چاوەش» بێ تۆ وا ڕێکی نەمانە
ژیانی بۆ زیان شێری ژیانە

# گێژی دووری

بــێ، کــه بــێ تــۆ بــێ نمــوونــەی ڕەنگمە
دڵ دەفـــە، ســـەر ســـازە، ســیـنـەم چەنگمە
مـن حـەیـاتم تـۆی حـەیـاتم، تـۆ کـە چـووی
مــن لــه ژیـــنی خـــۆم هـــەراســـم نەنگمە
وەســاڵــی تــۆ تــریــاکــە بــۆ مــن فـێـری بـــووم
گــێــژی دووریم و فــیــڕاقــت بەنگمە
تــۆ کــە ڕۆیـــی مــن نـــەمــردم، وەی لــە من
دائـــیـــمــەن ئێستێ لــەگــەڵ خـــۆم جەنگمە
هێند لە دووری تۆ ســەری خـۆم دا لە سەنگ
ســەنـگ نــەمـا بــۆ سینە ســەنـگم چەنگمە
هــەر کــەســێ پــەروانــەیــی شەمعێکە، من
بــولــبــولم گـــوڵ یـــاری شـــۆخ و شەنگمە
«چـــــاوەش»م سینەم دەهــۆڵــە لێی دەدەم
ئـــاســمـــان حـــەیـــرانی ســەیحــە و دەنـگـمـە

## تـاوی فیراق

خۆت دەزانی من دەمێکە عەبد و خزمەتکاری تۆم
چاو نەمین و دڵ غەمین و خەستە و بیماری تۆم
وەك گوڵی پەژموردەیی بێ ئاو لە بەر تـاوی فیراق
چاوەڕێی موژدەی شەواو و نەشئەیی ئەسحاری تۆم
هەر وەکو مەیموون کە هەر چاوی لە داری لۆتییە
جوملە ئەعزام بۆتە چاو و سەرخۆشی دیداری تۆم
مەیلی من هەر مەیلی تۆیە، من لە تۆ هەر تۆم دەوێ
مات و حەیران و ئەسیر و زار و بێزیواری تۆم
مەتڵەبم عەفوە، تکام بگرە بە حەققی پیری خۆت
عالەمێکم پێ ببەخشە چون سەگی دەربــاری تۆم

# گوڵی گوڵزار

موددەتێکە من کە غەمبارم ئەتۆ غەمخوارمی
بـــاغــەوانی باغی تــۆم و تۆ گوڵی گوڵزارمی
من مەتاعێکی کەسادم، بێ ڕەواج و ڕەونەقم
دەست لە قۆڵم بگرە، هەر تۆ ڕەونەقی بازاڕمی
بێکەسم کەوتووم دەڵێی کۆنە حەسیری مەنزڵم
ساحێب و مەولا و ئەمیرم تۆی و هەر تۆ یارمی
پێم بڵێ قوربان بە حەققی مەرقەدی پیری مونیر
من کە دڵـــدادەم بە تۆ، تۆش یـــاوەر و دڵدارمی؟
وەسفی تۆ بۆتە بژیوم، «چـــاوەش»م؛ مەنعم مەکە
ئوممەتێکی سەربەخۆم، تۆ ئەحمەدی موختارمی

بێگومان ئەگەر سەیید نەچووبایە نێو جیهانی تەسەووفەوە و شاعیری و نووسەری بە ناوی کارێکی هونەری بۆ خۆی هەڵبژاردبا، ئەمڕۆ لە مێژووی وێژە و ئەدەبی کوردیدا لاپەڕەیەکی زێڕینی بۆ خۆی تەرخان کردبوو.

سەیید لە ڕەوانبێژی و زمانپاراوی و شۆختەبعی و خۆشزەوقی و قسەی خۆش و نەستەق و شۆخی و گاڵتە و گەپدا، شاعیر و ئەدیبێکی کەموێنە بووە. «هێمن» کە لە تەمەنی تازەلاویدا سەیید ڕەشیدی دیبوو، زۆر جار دەیگوت: قسەی خۆش و شۆخییەکانی «سەیید» بێجگە لەوەی لە قسەی خۆش و شۆخییەکانی «برنارد شۆ» شاعیری بەناوبانگی ئینگلیزی کەمتر نەبوون، بەڵکوو لە زۆر شوێندا قسەی خۆش و جەفەنگەکانی گەلێ خۆشتر و شیرینتر و جوانتریش بوون.

بەڵام ئەو بولبولە خۆشئاواز و دەنگزولاڵە زۆر زوو کەوتە بەر چەنگی شابازی تەریقەت و چارەنووس و ڕێگایەکی تری پەیدا کرد و لەم ڕێگە و ڕێبازەدا دەفتەری شیعر و هەڵبەستی وەلانا و چوو بە شوێن ئەلفبایەکی تردا.

ئەو بەرهەم و شیعر و پەخشانانەش کە لە پاشی بەجێ ماون، پتر ئاکامی زەوق و قەریحەی سەرشارێتی کە بۆ خاتری دڵی خۆی و دۆستان دەمودەست بە سەر زار و زمانیدا هاتوون. یان ئەو نامە و پەخشانانەن کە بۆ خۆشەویستانی نووسیون و زۆر جاریش بۆ جوانیی و ڕازاندنەوە چەند دێڕ شیعر و غەزەلیشی لە پێوەندی لەگەڵ بابەتەکەدا لێ زیاد کردووە.

هەر بەم هۆیەوە بەرهەم و شیعر و پەخشانەکانی «سەیید» لە دیوانێکدا کۆ نەکراونەتەوە و بڵاو نەبوونەتەوە، ئەم مەبەستە بوو بە هۆی ئەوە کە ئەم شاعیرە هونەرمەند و بەهرەمەندە لە نێو شاعیران و بوێژانی هاوچەرخدا بە گومناوی بمێنێتەوە و مێژووی وێژە و ئەدەبی کوردی لە بەرهەم و شیعر و پەخشانە شاکارەکانی بێبەش و بێ بەهرە بێ و ئەوانەش کە بە دەستمان گەیشتوون، ئەوانەن کە لە سینەی زانایان و شاعیران و نووسەران و ئەدیبان و ئەدەبدۆستان و کەشکۆڵ و بەیازەکاندا تۆمار کراون و پارێزراون و یا ئەو نامە و

پەخشانانەن کە بە تێکۆشان و بە دوادا چوون و ڕەنج و زەحمەتێکی زۆرەوە توانیمان کۆیان بکەینەوە. «سەیید» لە نووسینی پەخشان و نامە و نامەکاریدا قەڵەمێکی بەهێز و بەتوانای بووە و لە داهێنانی نێوەرۆکی بەرز و جوان و مەبەستی تازە و داهێنەرانە و دەربڕینی عیبارەتی خاوەن کێش و سەروا «مسجع» و ئاهەنگین و ئاوازدار سوودی لێ وەرگرتن و شاکاری گەورە و کەموێنە و بەنرخ و نایابی لێ بەدیهێناون.

ئەگەر نامەکانی «سەیید» بە جوانی و بە وردی بخوێننەوە دەبینن کە لەم مەیدانەشدا پێشەنگ و پێشڕەو بووە و لە نووسەرانێکی بەناوبانگی فارسینووسی وەک «قائیممەقامی فەراهانی» و «ئەمیرنیزامی گەڕووسی» و شاعیران و نووسەران و ئەدیبانی تری پەخشاننووس و تەنزنووس دوا نەکەوتووە و بەتایبەت لە باری پەخشان نووسینەوە کاری لە دوو لایەنەوە جوان و داهێنەرانە و هونەرمەندانە بووە. تا ئەو جێیەی من ئاگادار بم بەر لە «سەیید» لە شاعیران و نووسەرانی کورد لە کوردستانی ئێران هیچ کەس پەخشانی نەنووسیوە و «سەیید» بە ناوی شاعیرێکی ناسکخەیاڵ و بیر و ئەندێشە تازە و داهێنەر و ڕچەشکێن بۆ یەکەم جار بە زمانی کوردی نامە و پەخشانی کێش و سەرواداری نووسیوە و ئەم بەشە زور گرینگەی هونەریی هێناوەتەوە نێو وێژە و ئەدەبی کوردییەوە.

«سەیید» لە کات و سەردەمێکدا پەخشان و نامە نووسینی بە زمانی کوردی دەست پێکردووە کە زۆربەی شاعیران و نووسەرانی کورد تەنانەت لە کوردستانی عێراقیش پەخشان و نامەیان بە زمانی فارسی و عەرەبی نووسیوە و تەنانەت بۆ مەبەستەکانی زانستی ئایینی و دینیش لە زمانی عەرەبی کەڵکیان وەرگرتووە.

«سەیید» لە نامە و پەخشانەکانیدا واژەی ساکار و سادە و ڕەوان و بێگرێ و عامیانە، زانایانە و شارەزایانە لە تەنیشت یەکتر دادەنێ و عیبارات و دەبڕینی جوان و دڵنشین و تازەی لێ دروست دەکا. هەر بەم جۆرەی کە لە مێژووی ئەدەبی فارسیدا «خواجە عەبدوڵڵای ئەنساری» بە تەواوکەری پەخشانی سەروادار دەناسین، لە مێژووی

ئـەدەبی کوردیشدا دەبـێ «سـەیید» بە داهـێنەر و بنچینەدانەر و تازەکاری ئەم جۆرە نامە نووسین و پەخشانانە بناسین، چون بەر لە «سەیید» باو نەبووە کە نامە و نامەکاری و پەخشان بە زمانی کوردی بنووسرێ.

لە پەخشان و نامەکانی بە زمانی کوردی و فارسیدا هەندێک تێکەڵاوی زۆر جـوان لەو دوو زمانە دێتە بەرچاو. پێشتر داوای لێبووردن لە خوێنەرانی خۆشەویست دەکەم کە نەمتوانی سەردێڕی هەندێ لەو نامانە دیاری بکەم. «سەیید» لە هەندێکیاندا ئیشارەی بە ناوی ئەو کەسە نەکردووە کە نامەکەی بۆ ناردووە، هەندێکیانم بە قەرینە بۆ دەرکـەوتـووە. هەروەها ئەگەر «سەیید» لە نامە و پەخشانەکانیدا هێما و ئیشارەی بۆ هەندێ کەس کردووە و بە ناوی جەفەنگەوە شتێکی نووسیوە، هیوادارم خزمان و کەسانی ئەوان لەو بابەتە دڵگران نەبن و پێیان ناخۆش نەبێ؛ چون لەو کات و سەردەمەدا هەموو کەس بە دڵ و گیان کڕیاری ئەم جۆرە شۆخی و قسەخۆشانەی «سەیید» بوون و تەنانەت شانازیشیان پێوە کردووە.

**نامەی یەکەم:**

قال الشافعي رضي الله تعالى عنه من استرضى ولم يرض فهو شيطان ومن استغضب ولم يغضب فهو حمار.

بابەکەم! تۆ خـۆت ناناسی عەجەب حاڵەتێکت هەیە، بە من موتەئەسیر نابی، دڵت پێم ناسووتێ، کە دە حوببی تۆدا ئەهلی فەنا و بەقام، ساحێبی شەرت و وەفام، گرفتاری جەفام، لە ژێرباری عەنام، بە دوژمنی دەست و کاسەشت کە موداخەلەت لێدەکا، پێت موتەلەزیز دەبـێ، پاشملەش حەبسی دڵخواهی نەفسی بەدخووی خۆی لێت دەوێ، لێشت دەخوا، لێشت دەخەوتێ، تووڕە نابێ، لێی لانادەی، بە عەقڵی ناقیسی من دۆستی لەگەڵ تۆ عەداوەتە، عەداوەت بە تۆ شایی و داوەتە.

قوربان! مەنزوورم ئەوە نییە بە گژ کەست داکەم، شەڕەسەگت پێ بکەم، مەقسوودم ئەمەیە دە خەوی خۆت بگە. قوربان! زۆرم ئومێد

به تۆ بوو، دەمکوت شوکر یارێکی وەفـادار و دڵدارێکی سەداقەت شیعارم کەوتە چەنگ، نەمدەزانی مارێکی ژەهرکار و کەمتیارێکی ئینسانخوارم هاتە جەنگ، ڕەجام بە قووەت بوو زەعیفت کرد، تەمام بە شیددەت بوو خەفیفت کرد.

قال النبي صلى الله عليه وسلم من قطع رجاء من ارتجاه قطع الله رجائه يوم القيامه فلن يلج الجنه.

ماڵت خرابێ نە بە ڕجایی فریو دەخۆی، نە لە خۆفی ئەندێشە دەکەی، نە غیرەت بە کار دەبەی، نە نەفسانییەت بە عەمەل دێنی، نازانم بە چت بگرم؟ بێئینساف قەت برایەتی وا دەبێ؟ ئەوە من لە ئاخری ڕەجەبەوە شەو و ڕۆژ بیستوچوار سەعاتە کوللی دەقیقێک چاوم لە ڕێتە، گوێم لە دەرکێتە، یاڕەبی خودا عەقڵێکت پێ بدا کە پێی خەجاڵەت بێ، ئینسافێکت بداتێ کە حەقێ تەسلیم کەی، دڵێکت پێ مەرحەمەت کا دۆست بە دۆست بزانی دوژمن بە دوژمن.

**بـا بـــدان بـــربـــاش و بـــا نـیـکـان نیکو**
**جـــای گـــل گـــل بـــاش و جـــای خـــار خـــار**

قوربان! دەستم لە هەموو کەس و هەموو شت بەردا، لە دامێنی تۆش بەند نەبوو.

**بــه یـکـبـار از جـهـان دل در تـــو بستم**
**نـــدانــســـتـــم کــــه پـــیـــمـــانم نـپـایـی**

تۆخودا بۆچ هیچ بە قسەی من موتەئەسیر نابی؟ قەسەم بەزاتی خودا لە خۆم و لە تۆ موتەحەییرم، لە تۆ کە چۆن هێندە بێ تەمیزی؟، لە خۆم کە بۆچ هیندە حیزم؟!

ماشاءالله لاحول و لا قوته الا باالله.

قوربان! مەملەکەتی خەیاڵم هەموو بە جووتی زبان شێو کرد، بە ئاموورى قەڵەم وەردم داوە، بە ماڵووی سفارش ماڵووم کرد، بەشی وەرزێکی دیکەم نەماوە، بە ئومێدێک و سەد هەزاری هەمووم داچاند؛ هیچی لێ نەڕوا. ئەوی کە ڕواش زیزانە بوو، کەسبوکارم حیزانە بوو، هەر چەند سەری خۆم دێنم و دەبەم فکرێکی بیکرم نەماوە کە

بیرازێنمەوە بۆ تۆی بنێرم، هەموو خۆیان لێشاردوومەوە، خۆیان لێباردووم، بە زبانی حاڵ پێم دەڵێن حاڵت خۆشە بێ حەیا؟ زۆرت شەرم بە خۆیە؟ ئاخۆ ئەو هەموو فکرە بیکرە کە دە لیباسی نەزم و نەسردا بۆی دەنێری، هەر هێندەی مەیل پێ هەن تا جارێکیان دەگەڵ دەنووێ، خراپیان دەکا، لە پاشان بە شەقان دەریان دەکا، دەربەدەریان دەکا، عاقیبەت هەموویان دەبێ بێنەوە کن تۆ، بۆچ هێندە بێناموسی؟، بۆ چ دەمری ئەگەر چ نەنووسی؟ دانیشتی بە مەئیووسی یا بچیە نێو عورووسی؟

**شیعرەکانم کە جگەرگۆشی منن دەربــــەدەرن**

**دڵی «نالی» چ ڕەقە، قەت غەمی فرزەندی نییە**

دەمکوت لێیگەڕێ مەحرەمی ڕازم جێگەی نیازم دەستکەوت، نەمزانی بە ناهەمواری بێچووە بەرازم تووش بوو! یاڕەب زۆر زۆر شوکر ناچارم وەک سەنعانی لێرەوپاش دەبێ پاسی بەرازان بکەم.

کە مەلا ئەحمەد هاتەوە فریوت دابوو، برات بوو بە بەراتت دابوو، کاغەزی سەرگەردانیت وەدەست نابوو کە «چند روز دیگر می‌آیم» من کە بە ئومێدی وەسڵت بووم بە قەباڵەی فەسڵەت چووم، لە قەبیل ئەوەیە هەستم بێمە «ڕەحیمخان» خۆم لێ وەدزی بلێی کاڵەکی بۆ بەرن، فرووجی بۆ وەکوژن، خۆ من «امالخبائث» نیم بە زگ دەگەڵت پێوە بووبم، بە خەیاڵ بێمە زگت داخۆ چ دەخۆی من ماچ و مووچەم لە یارم ناوێ، خۆی ناوێژمە سەر هەتا هەڵاوێ، کەسێکم دەوێ پێم ئاشنا بێ بە لا چۆ نەچێ بە وا بێ وابێ.

با وجوودی ئەوەش ئەوەم هەر لە چاودا کە لە ئاخری کاغەزەوە نووسیبووت: «بود بنده نازنین مشت زن» اما شما به بی‌انصافی خشت زن و به بی‌وفایی مشتی زنی و الا قول ما را در بی‌قولی کالبول قرار نمیدادی و انگشت منع را بر حرف ما نمی‌نهادی.

وام خەیاڵ لە تۆ دەکرد بۆ خوێنی خۆت قسەی من ناشکێنی، پەردەی من نادڕێنی، وا ناکەی ئەمن مەحزوون بم ڕەقیب مەمنوون بێ، ئەوێستاش یەکدەفعە لێت نائومێد نەبووم، بۆچ کە هاتی ئەگەر عاقڵ بی منیشت بە قەدری مریشکێکی هێلکەنەکەر پێ بوێ، بە خوای

کە کەوتیە عوزران خەجاڵەتم دەکەی، چونکە عوزر عەلامەتی تەوالود و تەوادودە، ئەگەر خۆ خوانەخواستە کەر و خیرەسەر و دەربەدەر بی، دەستت لە عەلاقەی من شوت بێ شێت دەبی دەڵێی: ئەیجا چ قەوماوە؟ توورە دەبی، لە عوزر دەکەوێ تا دەگەییە سیننی یەئس، دەبێ هەر بگریم، قورێ وەسەری کەم، بڵێم وەرە لە دنیایەدا برایەکت بێ ئەویش تەبەڕڕا پکا، بابێکت بێ دەرتکا، کورێکت بێ نەفەقەت نەکێشێ، دڵدارێکت بێ دڵت لێی بێشێ، حەیاتێکت بێ ڕووحت بکێشێ، ڕەجام وایە بە هیمەتی شێخی ئەو حاڵەمان بەسەردا نەیە زۆر لە جاران چاکتر ڕێک کەوینەوە.

والسلام

هەر چەند «سەیید» لە سەر دێری ئەم نامەیەدا ئیشارەی بۆ ناوی کەسێک نەکردووە، بەڵام وا دەردەکەوێ کە ئەم نامەیەی بۆ دۆستی خۆشەویستی خۆی میرزا عەبدوڵڵا نووسیوە.

**نامەی دووەم:**

**عزیـزی را کـه از اهـل تمیـز اسـت**
**بـه حـب حضرت یوسـف عزیز اسـت**
**هواخـواه گـروه صادقانسـت**
**تـو گوئـی کهربـای عاشقانسـت**
**بـه سـوقات دعـای خیـر داریـن**
**نهم بـر گردنش هـر دم دوصـد دین**
**کنـد گـر در ادای دیـن تأخیـر**
**شـود او هـم چو مـن از اهـل تقصیر**
**تفـاوت هسـت مـن بیدسـت و پایـم**
**از ایـن رو بی‌جـواب آیـد دعایـم**
**خـدا را شـکر نقـداً او عزیـز اسـت**
**خداونـد دل و دیـن و تمیـز اسـت**
**اگـر او در ادا تأخیـر دارد**
**بـه بی‌عـذر روا تقصیـر دارد**

آقای من برادرم سید محمد را سفارش فرموده بودند که اگر طاقت سفر و نقل را ندارد تا وقت اعتدال هوا معاف باشد، بزرگی به عمل آوردید خدای تعالی به حسن مجازات و قبول خاطر عزیزان بر ما و شما منت نهاد و طرفین و جمیع یاران را مشمول مراحم پیران کناد. آمین.

جناب آقا هم اگر وقت مساعد شود و شواغل از پیش برخیزد، وفا به عهد فرماید و تشریف را بیاورد و مدتی در خانقاه گوشه‌گیر باشد، شاید در مقابل بومی و کنجشک گیری له بازی و طفلانه است، شهبازی و کبوتر و نخجیری نقد وقت گردد.

**همین مگو ما را بدانشه باریست**
**با کریمان کارها دشوار نیست**

با وجود اگر تشریف را آوردند با همه کس آشنا و با ما در نبردید، شیخ شیرازی رحمه‌الله در مذمت نادرستان فرموده است:

**در برابر چو گوسفند سلیم — در قفا همچو گرگ مردم‌خوار**
**در برابر چو روبه گر بز — در قفا همچو شیر صاحب عار**

حالت جناب آقا با داعی خیرخواه ضد آن است، چون به تجربه رسیده است هر وقت ملاقات در بین واقع شد صورت جدال به میان می‌آید و هنگامی که غیبت پیدا شد اظهار مرحمت فرموده و مذمت را نسبت به داعی از مدعیان قبول ننموده‌اند، باز از دل و جان مترنم این آوازم که وصف‌الحال و مناسب مقام است.

**باز آ و مرا بکش که پیشت مردن**
**بهتر که پس از تو زندگانی کردن**

نۆبەی جەفەنگە؛ سەد حەیف مەلا سوڵتانی ئەحمەق حازر نییە تا بە گژ تۆیدا کەم، هەر ئەو گۆڕت دەکێشی، ئەرێ عەزیز توخودا بۆچ هێندە درۆزن و بێ وەعدەی؟ وەک وشتری نێو پەمۆ چاو دەقووچێنی و دەلەوەڕێی وەدەزانی کەس نەیدیوی!؟ ئاخر ئێمە ئینشاڵڵا دوو ڕۆژی دی یەکدی دەبینینەوە، ئەرێ ئەو سابوونە ڕەشەی کە لە کن ڕەشەی خۆت پێ سپی کردەوە چی لێهات؟ یا لە تاقەدا پشیلە خواردی؟

تووتنی نێو چیای دەڵێی کەمە، کاغەزی دەمەریۆڵ دەڵێی هەمە؛ ئەمما هەر بەشی خۆم دەکا. نۆشی گیانت بێ چاوم لێی نییە وەدەزانم خۆشەویستی خۆم دەعەمەلی هێناوە، لە کەمەرە شلکانی سولەیمانی بۆچ بەشم نادەی؟ دەی قسەت چییە؟ خێر وەڵا سەگەتیت لێ نابڕێ، پەشیمانم ئەوجار دەڵێم ڕووبەڕوو چاکی پاشملە ناپاکی، بابە کەیفی خۆتە عەزیز، تووڕە مەبە و هیچم ناوێ، بە خوای ئینشاڵڵا نەختێک هەوای خۆش کا یا دێی یا دێم تۆڵەی هەمووانت لێدەکەمەوە، باقی داستان فردا، در خدمت جناب ملا سعید به عرض دست بوسی مصدع و اهل مدرسه را سلام میرسانم.

بە خوای عەزیز هەر بەو قاعیدەی بۆخۆت داتمەزراندووە ئەگەر عیلاجێکی سەروقوونی برایم و بایزی نەکەی لە هەموو خێری خودای مەحرووم دەبن، ئەنجا کەیفی خۆشتە، صاحبی جناب مستطاب شیخ محمد ـ حفظالله ـ و قاطبۀ اهل خانقاه علیه به دعای خیر و سلام فوق الغایه یادآورند و به همت پیرانتان میسپرند، علیالخصوص جناب شیخ امین و ملا علی و مامحسین سلامرسان و دعاخوانند. عەزیز نازانم سەبەب چییە لەو بەینەدا چوار پێنج کەڕەت لە خەودا بە تەفسیل چاوم پێت کەوتووە، گفتوگۆ و سوحبەتی زۆرمان بووە، لە خەودا ئینسانتری، ڕەنگە ئاگات لە خۆ نەبێ، لە خەودا هەنگوینی بێ مێشی، سەلیم و موسوڵمان و ڕەئوف و میهرەبانی، ئەمما بە زاهیر جارجار خۆت ئەحمەق دەکەی، ڕەنگە هەر مەتڵەبت ئەوە بێ لەبیرت نەچێتەوە، دەوری دەکەیەوە، گاهگاهێ وەک فەقێکان قەدەم لێدەدەی و کەسبی تووڕەیی دەکەی، حەتتا ئەحمەد بەو هەموو منداڵییە ئەوەندە حاڵی بووە دەڵێ ئاغا تۆڵەیە! ڕاست دەکا هەر هێندەی لێدەزانێ، دەنا شتێکی زلتری دەگوت، عەزیز ئەگەر شەرمت بە خۆ بێ بەستە، ئەحمەق، خەڵک لە دەرەوە بە پیاوێکی تەواوت دەزانن، لە کنیان وەیە لە دەرەوە و لە ژوورەوە هەر چاکی، پیاوی چاک بە، ئەو هەموو عالەمە وەدرۆ مەخەوە، چیدی لە گوێی گایدا مەخەوە.،

**ز گـوش پنبـه بـرون آر و داد خلـق بـده**
**و گـر تـو مینهـی روز دادخواهـی هسـت**

عەزیز مەحزی کەیفخۆشی تۆ خۆم هێندە ئەزیەت داوە، ئەگەر زۆریشت پێخۆش نەبێ تووڕە مەبە هێشتا قەباڵەم مۆر نەکردووە، با هەر وا بێ مۆر نەکرێ، زیاده ایام به کام و عمرتان مدام باد، آمین،
السلام علیکم و رحمت الله و برکاته
محمد رشید

«سەیید» ئەو نامەیەی هەر وەک لە سەردێڕ و نێوەرۆکەکەیەوە دەردەکەوێ، بۆ عەزیزئاغای عەباسی نووسیوە کە یەکێک لە پیاوە گەورە و بەناوبانگەکانی ناوچەی موکریان و یەکێک لە مریدان و خۆشەویستانی شێخی بورهان بووە. وەکو زۆربەی مەنسووبان دوای وەفاتی شێخ لەگەڵ خوالێخۆشبوو «مەولانا محەمەد سادق» خەلیفەی شێخ بەیعەتی تازە کردۆتەوە و دەستی ئیرادەتی داوە بەم پیاوە خواناس و سۆفی و ئایینپەروەرە.

**نامه سوم:**

قربانت گردم: بعد از این که قاصد مراجعت نمود اسباب خیالات فاسده برای چاوشت فراهم آمد، من جمله اندیشه می‌کنم که از دشنام‌های محبت‌آمیز مودت‌انگیزم اگر سر دفتر ارباب تمیز را خدای ناخواسته غباری بر خاطر نازک فرو نشیند و تنزلات و حقوق سالیانه خاکسار را در نظر همان یار عزیز اعتباری نماند و داغ حرمان را بر جبین نامرادی نشاند، خاک کدام سرزمین را به سر کنم و دیگر از کمی توتون اگر خیالی بفرماید و از این رو دلگیر آید چه چاره سازم و خود را به کدام خاک پا دراندازم و به کدام قدمگاه سر اندازم، و الحاصل از اندازه بدر غم و اسف و ندامت بر خاطرم جمع آمد و بنیان عیشم را قلع و قلعه، عشرتم را بالمره قطع نمود. در ورطهٔ غم غوطه می‌خورم تا امشب که پنجشنبه بیست رجب است در موقعی که سلطان جهان‌آرا در آن میان قدر پر کاهی نبودی و خسرو خاور را از پرتو نسبت آن حضرت خلعت «وجعل الشمس ضیاء» پوشیدی و ماه گردون جاه از شعاع طلعت او شربت «والقمرنورا» نوشیدی، مکرراً معروض داشتم که تصدقت گردم فلانی نووسیبووی بۆم عەرزی شێخی بکە لەو بەیتولماڵە حەقیقییە کە خودا وە کن تۆی ناوە و تۆی کردووە بە موقەسیم کە لە بەینی ئەسنافی سەمانییەدا تەفریقی بکەی

منیش یا موئەللەفەتولقولووبم یا سەگی فوقەڕام، بە هەر جیهەتێ لەم دوو جیهەتە لە ئەربابی ئیستیحقاقم ڕجام واسیقە کە حەزرەتی ئەرحەمولعالەمین بێ بەشم ناکا، شێخ پێکەنی فەرمووی: دەی دەی ئەدی جوابت بۆ نەنووسییەوە؟ بۆی بنووسە کە شێخ دەڵێ بەڵێ: منیش وەک ئاوی جاری لە تینوان دەگەڕێم، شەڕم دەگەڵ مەنسووبی خۆم هەر ئەوەیە کە کەسێکم وەدەست کەوێ ئەهلی ئیستیحقاق بێ، خۆی بە موحتاجی ئەو بەیتولماڵەی بزانێ کە وەزیفەی ئەسنافی سەمانییە و بەراتی داخیلینی ئەبوابی سەمانییەیە، ئەمما شرووتی هەن: بەڵێ لە وان ڕوشدە، یەکێ لە وان تەسدیق بە وجوودی ئەو بەیتولماڵە، یەکێ لە وان ئەوەیە دەبێ جەواڵی خۆی بە کۆڵ دادا بێتە کن موقەسیم بە تەوازوع جەواڵی خۆی وەرگرێ تا بۆی تێکەن، هکزا دەی خودا بەشی بدا یاخودا، بە خوای زەکاخۆشە!، عەرزم کرد بەڵێ بەعزێکم لە وانە بۆ نووسیوە:

**بە دیدار تو چندان مایلستم — کە از غیر تو یکسر غافلستم**
**چنان سرمست و حیرانم بە هجرت — بە درد خویشتن هم جاهلستم**
**بە قامت سرو آزادی بە رخ گل — منت هم قمریم هم بلبلستم**
**دل آید سوی تو من در پی دل — چە سازم خود گرفتار دلستم**
**فراقت کرد بیزار از حیاتم — بە مرگ خود کنون مستعجلستم**
**ز اشک حسرتم گلگشت گل گشت — بە هر دو پای اکنون در گلستم**
**بە ماضی حال «چاوش» این چنین بود — کنون در غصۀ مستقبلستم**

والسلام

**نامەی چوارەم:**

مام قەرەنی دەمێکە نەمدیوی، ئەودیو ئەودیوم پێنەکردووی. بزانم ئەو دێوەی کە دەگەڵتە چی لێکردووی، بە هەر سوورەت سەلامت لێدەکەم، دوعای بەخێرت بۆ دەکەم، کاغەز هەڵناگرێ ئەوەی کە خەیاڵم هەیە پێت بڵێم، بۆچی زۆر هەڵدەگری ئەگەرچی زۆر زەعیفی، شا کەرە دەنا دەبوو زەخیرەی سەردەشتێ بەتەنێ بە تۆ هەڵگرێ. ئەگەر وا نەبێ فائیدەی تۆ لە دەرەوە ئەوەیە کە فەقەرەیەک دە

نێو مەنسووبی حەزرەتی شێخدا، ڕووحم بە قوربانی بێ، ڕووی دا خەریک بی ئیسلاحی بکەی، مادەی کاک عەبدوڕەحیم کە لە ئەسحاب و مەنسووبانی قەدیمی مەولاییە دەبوو ئێمە پێ نەزانین چاکی بکەی پاکی بکەی، نەوەک خۆت کەر کەی بێ باکی بکەی، فائیدەی ئێمەش لە جیواری مەرقەدی مونەوەردا ئەوەیە بە دەردی ئێوە دەردەدار بین، بە غەمی ئێوە گرفتار بین، غەمخوار بین، غەمگوسار بین «مستغفر بالاسحار» بین.

موختەسەر ئەمن بڕێکم ئاگا لە خۆیە، بەخوای وەزیفەی خۆم بە کوللی تەرک نەکردووە، دوعاگۆیی دەکەم، ئەتۆش کەدخودایی و ئاغایی بکە وە ئیلا دەبیە کەیبانوو.

عەلەلحیساب برای موکەڕەم مەلا ئیبراهیم ئەگەر بە هیمەتی شێخی بە ڕەزامەندی گەڕاوە، بابی لە جێی خۆی دامەزراوە مەجبوورم یەک بە سەد دەبێ لە دوعاگۆیی زیاد کەم وەئیلا دوو فەقەرە پەیدا دەبن، یەک بە سەت نازانم، دوو بە کەرت لە قەڵەم دەدەم. دەمێکیشە نەهاتووی جەریمەداری، یا هەر نایەی، یا دێی زوو دەڕۆی! ئەوەندە بەند نابی نەختێ بە سەر و گوێت دادەم، وەڵا نازانم بە کوێت دادەم؟ چ جێی ساغت نییە و ئاخری قسان دوعا و سەلام بێ، مەعنای «بێ» دەزانی مەعنای وەرە؟ دەبێ لە ئەلفوبێوە پێت بخوێنمەوە، قەرەنییە خەرجی جووتبەندانی لە سەرە.

دوعا و سەلامی من بە بابەکراغای بگەیەنە، بۆیە کاغەزم عەلاحیدە بۆ نەنووسی وەک قسە دەکەن دەڵێی بابی نەماوە، ئاخر ئەوە موعەمایە، بابەکر کە بابی نەما کەر دەبێ، ئەگەر کەر نەبێ بۆ دەبێ کار بە دەرەجەیەک بگا پیاوی وەک کاک عەبدوڕەحیم جواب بکا، ئەمن عەرزم کردووی شاروێران بە کەران ئاوەدانە ناحەقم نییە، موختەسەر، دوعا و سەلامی منی پێ بگەیەنە لێشی قەبووڵ مەکە کاک عەبدوڕەحیم لەوێ بڕوا.

والسلام

محمدرشید

«سەیید» ئەم نامەی بۆ قەرەنیئاغای خاوەنی دێی «قزڵقۆپی» ناوچەی شاروێران نووسیوە.

**نامەی پێنجەم:**

قوربان! ئەمشۆ کە جومعەیە بۆ نوێژی مەغریبێ چوومە دەرێ بانگ دەم، مانگ لە تەرەف تۆوە لە ژێر هەوران هاتە دەرێ، وای نوواند کە عەزیزت منی لە باتی خۆی ناردووە، کوتم بە خودای لە باتی وی قەبوولٚت ناکەم، حەتا کە تەماشاشت کەم، بۆیەت تەماشا دەکەم کە لە تەڕەف وڵاتی وییەوە تلووعت کردووە و هەم بە خەجاڵەتی لەوێ هەڵاتووی، یەعنی تاقەتی موقابەلەم نییە، ڕێم ناکەوێ بەند بم، «دوو پادشاه در اقلیمی نگنجد» خێر خێر، تۆ بەندەی وی، تا بەندەش بی، تا بەندەی وی خۆشم دەوێی، ئەما ئێستێ چونکە هەڵاتووی زۆرت لێتووڕەم، بۆ تۆ ئەدەب وا بوو کە هەڵنەیەی، هەڵاتی ئابڕووت چوو، کە وام گوت، جوابێکی خۆشی دامەوە، دڵی هێنامەوە، فەرمووی:

**لە خۆفی تەلعەتی، ڕۆژ هەر وەکو شێت**
**بە ڕووزەردی هەڵات و کەوتە کێوان**

ئەمن چۆن پێم دەکرێ بەند بم، ڕاستە بەندەم ئەما ڕووم نییە لە خزمەت ئەودا بەند بم، هەر ئەوەندەم پێدەکرێ ئێواران دێمە دەرێ، بێ نوورم هەتا شەوێ، چاوم بە وی دەکەوێ، دەبم بە ڕۆژی شەوێ، ئەوجار سەیر دەکەم، ئەوە یەک، یەکی دیش فەرمووی: «دجاله ز پیش شه ز دنبال آید»، ئەمن ئەوشۆ هاتم ئەو سبەی شەوێ دێ، تەفاوەتمان زۆرە، ئەمن مانگی سێزدەم ئەو مانگی چاردەیە، ئەو بەدرە، ئەمن بەدرەقەم، ئەو ڕۆژ دەکا بە شەو، شەو دەکا بە ڕۆژ، ئەو سبحەینان کە دێتە دەر ڕۆژ هەڵدێ، شەو کە هاتە دەر مانگ تەماشای ئەرزی دەکا، هەناسە هەڵدەکێشێ ناتوانێ بێتە خوارێ، گوێی لێ نییە کە خەڵکی دەڵێن مانگ و ڕۆژە، بە زبانی حاڵ دەڵێ با هەر شەرمەندەی ئەو ڕۆژە بم، لە شەرمان لە سەرمان ئاوا دەبێ، کە وای کوت کردمە تەفەئول، زۆرم دوعا کرد، ئێستا مونتەزیرم.

**وەرە ئەی مەهی دوو هەفتە کە لە قامەتت بڕاوم**
**لە قییامەتت بترسە بە خودا دەکەویە داوم**
**مەڵێ بۆ نەمردی «چاوەش» کە لە من بڕای حەیاتم**
**کە ئەمەت لە کن حەیاتە بە ئومێدی وەسڵە ماوم**

والسلام

هەر چەند «سەیید» لە سەردێڕی ئەم نامەیەدا ئیشارەی بۆ ناوی کەسێک نەکردووە، بەڵام وا دەردەکەوێ کە ئەم نامەشی بۆ دۆستی زۆر خۆشەویستی خۆی میرزا عەبدوڵڵا نووسی بێ.

**نامەی شەشەم:**

براکەی بابم بۆ تۆ کەبابم، ئاوڕێکم لێدەوە ئاورێکم لێ وەکوژێنە، ئەوجارەش وەمژێنە پیاوی چا بە هەوای وێنان ڕۆنێ، ڕوتبەی دوونان ڕەچاو مەکە، نیعمەتی زاهیری و ئاییني دێرەدا، هەستە وەرە دێرە، مەچۆ دەرەوە لێرە، ئێرە پڕ لە خێرە، دەرەوە پڕ لە شەڕە، زیندانی بێ مەفەڕە، مەنفەعەتی زەڕە، باری اگر حالت «چاوش» مشوش سراسر غش مرحمتاً پرسش می‌کنی این است کهٔ عرض می‌کند دیگر مختارند:

**بادی کە گذارش بە سر کوی تو یابم**
**جان باد فدایش کە از او بوی تو یابم**
**خاکم بە رە هر کە گذر سوی تو یابد**
**چون نیست رهم آنکە گذر سوی تو یابم**
**زیر قدمت باد سرم چون ندهد دست**
**کش بالش راحت سر زانوی تو یابم**
**جز ضربت تیغ ستم و تیر جفایت**
**کامی کە من از ساعد و بازوی تو یابم**
**خواهم کنم از رشتهٔ جان بند قبایت**
**تا دمبدمش بستە بە پهلوی تو یابم**

تۆ دەتگوت ئێسکێکم بەسە ئێستا لە پلاو و عەنبەربۆش تێپەڕی
والسلام

«سەیید» ئەم نامەیەی بۆ دۆستی زۆر خۆشەویستی میرزا عەبدوڵڵا نووسیوە و لە سەرەتاوە بە غەزەلێکی شاعیری خواناس و پایەبەرزی ئێرانی مەولانا جامی ڕازاندوویەتەوە.
شایانی باسە «وێنان» یا «یۆنان» ناوێکە کە «سەیید» لە چەند

جێگا لە نامەکانیدا ئیشارەی پێدەکا، لەوانەیە مەبەستی دێی «ڕەحیمخان» بێ کە میرزا عەبدوڵڵا لەوێ نیشتەجێ بووە، چون دەوڵەتی یۆنان ماوەیەک لەگەڵ حکومەتی عوسمانی لە شەڕدا بووە و مسوڵمانان ئەم دەوڵەت و وڵاتەیان بە دوژمنی ئیسلام زانیوە و لەوانەیە «سەیید» مەبەستی ئاوایی «ئەرمەنیبڵاغی» بێ کە میرزا عەبدوڵڵا جاروبار هاموشۆی وێی کردووە، بۆنە و موناسەبەتەکەشی دیار و ئاشکرایە، چون ئەرمەنیەکانیش وەکو یۆنانییەکان عیسەوی مەزەبن و مسوڵمانان شەڕی ئەورووپاییان و یۆنانیان لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی پێ شەڕێکی ئایینی و مەزهەبی بووە.

**نامەی حەوتەم:**

عومەر گیان! ئومێدەوارم عومرت درێژ بێ، دوژمنت گێژ بێ، مانیعت مێ بێ، نەفەقەت پێ بێ، پیری بورهانیت لە پشتێ بێ. عەزیزم شەبخێز بە، شوورئەنگێز بە، کەمتر حیز بە، هەزار جار لە ڕێی دنیادا گیراوی بڵا لە ڕێی خوداشدا بەردێکت بێتە بەر پێ. ئیقدام موبارەکە، هەستە وەرە، مەعزەرەتت هەر وەرە وەرە، سەی حیز بە خۆڕایی لەبەر خۆیەوە دەوەڕێ. ئەتۆ ئاغای من «چاوەش»م؛ دەگەڵ منت پێ ناکرێ. ڕەشید کۆنەچاوەشە.

«سەیید» ئەم نامەی بۆ عومەرخانی شکاک نووسیوە کە دوای سمایلاغای سمکۆ سەرۆکی عەشیرەت و ئێلی شکاک بووە.

**نامەی هەشتەم:**

جناب مستطاب ظهیر و متین آقای ملا محمدامین مەحفووز بی لە شەڕی سێ شین؛ شینی شەهوەت و شینی شۆهرەت و شینی شەیتانی لەعین. لە کاروباری تەولییەدا موازیب بە بارێکی گرانە ئەمرێکی خەتیر.

**سجیللی نەفسی ئەممارە بەرازە**
**دزە، حیزە، خەریکی تورکتازە**
**لە تاعەتدا کە نەتبێ لوبسی تازە**
**بە بالاپۆشی «کرمنا» مەنازە**

مینە خرەی بگرە خرِی هەڵدە؛ قەرزی قەدیمی «عبدالله جدیدالاسلامی» لێ بستێنەوە.

والسلام، محەممەدرەشید

«سەیید» ئەم نامەیەی بۆ مەلا محەمەدئەمینی شکاک، مەلا و پێشنوێژی دێی «ئاتابلاغی»، نووسیوە.

**نامەی نۆیەم:**

**ای کە دیدار تو درد بی دوا را مرهم است**
**هر غمی بی روی خوبت جان ما را همدم است**
**نامە را در هم چو بینی جان من معذور دار**
**ز آن کە دل از درد دوری درهم است و برهم است**

کورە بەس کەر بە، کەڕ بووم گوێرەکە، بەس کەڕ بە گاگوێ، بێ ڕێ، بێ دەرپێ، و شتر پێ، کۆڵان کوت، یالان تووت، کووڵەکەی ئاوی، چەوەندەری دێمی، باسکێشی کەران، کۆڵەکەی هۆڵێ.

**باسکێشی کەران، کۆڵەکەی هۆڵێ**
**ئارەزووی نەنکت گرمەی دەهۆڵێ**
**پاڵەوان کەچەڵ، بەدمەستی جەنگی**
**شۆخی شێوەزەن، تینەت فەرەنگی**
**تا کەی لە دووریت ...**
**زوڕنات شکاندم، هەی کۆنەدمبەك**
**چاوشینی مووزەرد، سووری فیتنەجۆ**
**تا کەی بناڵم بگریم لە دەست تۆ؟**

**ڕووڕەش، پڕ لە غەش، کوشەندەی «چاوەش»**
**بۆ تۆ جوولەکەی وەسڵت بۆتە هەش؟**
**مەئموولی نەنکت تیلای باپیرت**
**تۆی تێوە هەرچی بۆتە وەزیرت**
**پشکەڵە وشتر، کۆدەڵە مستۆ**
**من مردم خوێنم کەوتۆتە سەر تۆ**
**مەیموونە سووکەی لۆتی نەوادە**
**بە مەیلی «چاوەش» دەمێکی لادە**
**دەمێکە «چاوەش» چاوی لە ڕێتە**
**دەرمانی چاوی غوباری پێتە**
**هەڵستە، زوو کە، دەمرێ لە داغت**
**بولبول بە زیزی دەفڕێ لە باغت**

قوربان هەرەشەم فەوتان ئەوێستا لەبەر ناپیاوی تۆ وەک منداڵان دەگریم، هەتا وەک ژنان دەستم بە تووک و دوعایان نەکردووە، لە کەری شەیتان دابەزە، سواری ئەسپی ئینساف بە، هەتا هار نەبووم، وەرە دەنا وەڵڵا سلووکێکت بۆ دەکەم، ڕووی خۆم لە دەست تۆ ڕەش دەکەم، هەتا دەمرم دوعای خێرت بۆ دەکەم، ئەمما دەشترسێم خودا لێم قەبووڵ نەکا. زۆرت دڵ بریندار کردم، ئاخ مردم.

والسلام

«سەیید» ئەم نامەشی بۆ دۆستی زۆر خۆشەویستی خۆی میرزا عەبدوڵڵا نووسیوە.

**نامەی دەهەم:**

چۆن وا دەبێ؟، من هێندەم تۆ خۆش دەوێ، من لێرە بم، تۆش لە وێ. من لێرە بگریم بە تاو، من لێرە مابم بە ناو، خەبەر بنێرم نەیەی، نە دەستم دەیەی نە پەی، دەرسم لە کن نەخوێنی، دڵیشم لێ بڕفێنی، تەڵەب دەکەم لە شێخی وەژێراو دەردت بێخی، تا قەدری بزانی، نەبیە جووی ڕەحیمخانی، میرزاڵەی ڕەحیمخانی، وەرە کن یاری جانی،

ڕوو بکە پیری بورهانی، با نەبیە کۆنەکانی، نەبیە سەی شارستانی، کە دەچیە نێو فەقێیان، سەفەر دەکەی بە پێیان، دەبیە لۆتی لادێیان، بۆ نان دەکەویە کووچان، دەکەویە ماچوموو‌چان، کوتەک بە دەستی ملهوڕ، قەدت دەبێ بە گۆچان، دەڵێن درەنگە میرزا هەڵستە چێشتی لێ نێ، ئەگەر بۆڵەت لێوەبێ دەڵێن دۆڵمێکی تێنێ. سەرت بگاتە هەوران دەتکەونە دوو بە تەوران، ببی بە شاهی مەردان، پێت دادەن بە بەردان، کە وا بێ پیاوی چا بە مەشغووڵی ئیرتیقا بە، کوڕێکی باوەفا بە، هەر تالیبی توقا بە، جۆیای فەنا و بەقا بە، عیلمت دەوێ زەریفە، حوجرەت دەوێ تەمیزە، شێخت دەوێ عەزیزە.

والسلام

لە بەشێک لە نامەیەکی دووروودرێـــژی دی دیسان بۆ میرزا عەبدوڵڵای دۆستی زۆر خۆشەویستی دەنووسێ.

**نامەی یازدە:**

یا شەمسەدین مددی

باوەلێ باوەلێ! جەنابی سەیید «عەبدولڕەحیم»؟ کاک سەیید؟ کوێخا مەحموود؟ سۆفی مەحموود؟ سوبحانەڵڵا خەویان گرانە، بە خوای ناپاکن، بە خودای بێ باکن، بێ ئیدراکن، لە خودای ناترسن! لە شەیتان ناپرسن! ئینسان با لە کاری شێخیشدا بێ، کە زۆر لە دەرەوە بەند بوو ژەنگاوی دەبێ، سەلیقەی کەم دەبێ، عیلمی نامێنێ، دینی دەشێوێ، وەک عەبدوڵڵای لێ بە سەر دێ. جاران لە دەرەوە دەگریا، ئێستا لە سەربانان پێدەکەنێ. جاران دەهات لێرە دەچوونە بەر گوێلکان، ئێستا لەوێ دەچنە بەر کەران؛ زگ کوڕان، کن کچان. قـەدەرێ لەمەو پێش کوتیان لە مەحموودی دواون، سەری کێوانم لێوێک هات، قەندم پێ تاڵ بوو، عەیشم هەر چەند ئیستمزاجی شێخم کرد شوکر ئەسەری عەجزم نەدی.

**نامەی دوازدە:**

دەنووسم وەرە وەرە، دەڵێی وەرە وەرە. دەنووسی مەسڵەحەت وایە تا نییەت نەیەم. ئەی گوو بە مەسڵەحەتت، ئەو مەسڵەتە شەیتان بۆی کردووی، بەڵێ شەیتان بۆی کردووی، تێت گەیوە بۆ کەری و سوارت بووە. ئەی عومری نەفسیت نەمێنێ دەگەڵ تەدبیرت، مەرگی نییەتت بێ دەغەڵ بۆ پیرت، وەکیلت لێرە حاڵی خۆشە، لە سایەی تۆوە ترێ براوە، چیدی بەدەستەوە نەماوە، وەک کەر نا، وەک تۆلە قوڕدا ماوە، لە شەرمەساری چاوی بەرداوە،ماڵت خرا بێ کە هاتیە ئێرە خۆ ناتخۆم:

**ای سـنـده صـبـا زحـسـرتـت مـرد**
**آخــر بــدرآ نـخـواهـمـت خُــرد**

ماڵت خرابێ تۆ هەتا منداڵتر بووی گەورەتر بووی، تا زل دەبی غافڵ دەبی، چلوفل دەبی، شەقوشل دەبی، جاران عاقڵ بووی ئێستا غافڵی، جاران کامڵ بووی ئێستا گاملی.

والسلام

«سەیید» لەو نامەیەدا ئەم چەند دێرە پەخشانەی بە هەموو جۆرە جوانکاری و ڕەوانبێژی و خۆشخوانی وەکو سەجع و جیناس و تەتابوق ڕازاندۆتەوە.

**نامەی سێزدە:**

و دیگر آهوی رمیده در پیش ما نیارمیده، در نامۀ خودش که به من رسیده است، نسبت به دختر نیک اختر شما جسارت ورزیده خلاف ادب را به عمل آورده بود چطور؟

زاهیرەن لە سەر کاغەزی دوو وەرەقی کە پێی خرا بوو ڕقی هەستا ئەما ڕەقی هەستا بوو، دەفتەرە سێ وەرەقییە تازەکەی هێنابوو دە بن چۆکی خۆی نابوو، دوو وەرەقی لێک کردبۆوە، قەڵەمێکی ئامادەی دە بەرزگ چەقاوی، بە هەوا ڕاوەستاوی، لە دۆ پڕکراوی، بە گوێزان

دادراوی، عەمەل دەستووری، کەوا سووری، زۆر مەغرووری، سەر ئەستووری، مەیلاوژووری، مایلالتنوری بە حەیتەڵمەز مەشهووری، فەرەنگی هەیکەلی، عەموود مەسیلی، ابنالسبیلی شیغار قەتیلی، دوژمن زەلیلی شەیتان دەلیلی، تالبالمسیلی، لە ئینساف دووری، دەعوا خڕی، دەروون پڕی، دوژمن قڕی، بەرزگ دڕی، دیوار بڕی، داوێن گڕی، مێرەر خڕی، نێو قوزبڕی مەیدان زۆری میداد خۆری فرمێسک دۆی، مەرکەب سپی گردەڵنشینی، قەرەتەپی ئابی لە دینی گرینۆکی پڕ قار و قینی دنیا بەری قیامەت نەبینی، سۆفی وەشی میحراب گوزینی دووراودوور درێژ و وەرەقی نێوەڕاستی کوتا بوو، کوتا بووی، کوتا بووی هەتا هیچی لێ نەمابوو، خۆشی بە سەر دادابوو، لەو شێوەیەدا ڕوابوو، عەفوی دەکەی پیاوەتییە، خوێنت دەوێ خوشکی هەیە، عەیبی نییە کفن بە من ببڕێ مردوو گۆڕبەگۆڕ چێ، عەفووی دەکەی دووتانم دەوێ، خوێنت دەوێ پێشکەشی دەستێنم، زێڕ و زێوم ناوێ، جەواهیر تەڵەب دەکەم، لە پاش ئەوەی پێشکەشم کرد دووبارە بە خۆتی پێشکەش دەکەمەوە، نە شیش بسووتێ نە کەباب، گەندە لە مەندە کەمتر نییە، کچ بۆ کوڕ، ژن بۆ پیاو، دوعاگوتم زۆر بەتاو، مەتڵەبی خۆم دی تەواو، چاوەشی تۆم.

والسلام.

ئەمەش بەشێک لەو نامەیە کە بۆ میرزا محەمەد ڕەسووڵ ناوێکی نووسیوە و هەر وەک لە ناوەرۆکی نامەکەوە دەردەکەوێ یەکێک لە شاگردانی پێشووی «سەیید» کچەکەی لە خۆی مارە کردبوو، یا ویستبووی کە لە خۆی مارە بکات:

## سەیید ڕەشید و گاڵتەوگەپ

دوکتۆر عیززەدین مستەفا ڕەسووڵ: زانای پایەبەرزی کورد لە کتێبی «ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی»دا دەڵێ: قسەی خۆش و گاڵتە و گەپ لە جیهانی ئەدەبیاتناسی و فۆلکلۆرناسی‌دا جێگەیەکی گرنگی هەیە و زۆر لە زانایانی جیهان بە کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوەیانەوە خەریک بوون، قسەی خۆش و گاڵتە و گەپ بەشێکی بە نرخی سامانی نەتەوەیی و ئەدەبی سەرزاری خەڵکە و یەکێکە لەو جۆرە ئەدەبانەی کە شەقڵی شوێن و کات و سەردەم و سەدەی خۆی پێوەیە و دەبێتە ئاوێنەی تایبەتی گەلێک لە ڕووداوەکانی خۆی.

قسەی خۆشی کوردی یا خود ئەوی هەموو نەتەوەکانی‌تر ئێستە وەک هەموو بەشێکی فۆلکلۆر دەمادەم و پشتاوپشت یەک بۆیەکی گێڕاوەتەوە، بەو پێیە لە گێڕانەوە و زۆر مانەوەدا بە پێی کات و شوێن و دیالیکتی ئەو کەسەی دەیگێڕێتەوە گۆڕینی بەسەردا هاتووە، قسەی خۆش لە ڕووی ژانری ئەدەبییەوە دەچێتە ڕیزی حیکایەتی کورتەوە، هەر چەندە بە هەموو بارێک قسەی خۆش هەر لە ڕیزی فۆلکلۆردایە نەک ئەدەبی نووسراوە.

قسەی خۆش چیرۆکێکی کورتە بەڵام بە جۆرێکی گاڵتە ئامێز دارێـژراوە و گیانی پێکەنینی بە بەردا کـراوە، پێکەنین لە ئەدەب و ژیـاندا جاری وایە هۆیە، جاری وایە لە خـۆی‌دا مەبەستە، ئەو پێکەنینەی هۆیە، ئەوە لە کۆڕی ئەدەبیاتدا دەبێتە ژانرێکی تایبەتی، دەبێتە هۆی ڕەخنە گرتن لە هەموو دیمەنێکی ناهەموار و خوار و چەوت لە ژیاندا، دەبێتە هۆیەکی تیژی گەڕان و پشکنین لە هەموو لا، لە هەموو جێیەک، لە هەموو کاتێک‌دا بە دوای کەم‌وکوڕی و باری نالەباردا و لە شێوەی گاڵتەدا بەو دیمەنە پەردە لە ڕووی ئەم کەم‌وکورتییە لادەدرێ.

ئەو پێکەنینەی هۆیە لە خۆی‌دا هاوار و نرکەیەکی ناڕەزایی و پڕ و تێستە بەرامبەر بە هەموو شتێک کە بە لای ئادەمیزادەوە چەوت و ناڕێک بێت، ئیتر ئەو شتە یا کەسێکە یا کۆڕێکە یا دەوڕوزەمانێکە یا

ڕژیم و دەستەیەکە، زۆر جار ئەم جۆرە پێکەنینە لە دەروونێکی زامدار و پڕ لە ئازارەوە دێتە دەرێ و دەبێتە دەنگێکی سەر شۆڕ نەکردن بۆ باری چەوتی ژیان و بانگێکی هیوا سەرکەوتنە و شێوەیەکی گاڵتە کردن و بە سووک زانینی باری چەوتی ژیانە هەر لەم ڕووەوەیە کە گەلێک لە مێژوونووسانی ئەدەب قسەی خۆشیان دابەش کردووە بە سەر خانەی قسەی خۆش و گاڵتە و گەپی سیاسی و کۆمەلایەتی و ئابووریشدا ئەمڕۆ لە ژیان و جیهانی گەلاندا بەتایبەتی لە ولاتانی ئەورووپادا گاڵتە و گەپی سیاسی لە مەیدانی ڕەخنەگرتنی سیاسی و دەربڕینی بیری خەڵکیدا جێگەی خۆی هەیە و لە زۆر ولاتدا ڕابەرانی سیاسی و کاربەدەستانی گەورە خۆیان بە دوای ئەم جۆرە گاڵتە و گەپەدا دەگەڕێن کە زۆر جار دەبێتە ئاوێنەی ڕاستەقانی ڕای خەڵک بەرامبەر بە خۆیان و کرداریان.

هەروەک فۆلکلۆر تێکڕا بە سەرەتای ئەدەبی نووسرا و دەزانرێ هەروەها ئەم بەشەی سەرەتایە کە بۆ نووسینی ئەدەبی گاڵتە ئامیز کە بە «ستیر» و «یەمور» ناو ئەبرێ، ئەو پێکەنینەش کە «هۆ» نییە و مەبەسە ئەویش جێگەیەکی تایبەتی خۆی لە مەیدانی ژیان و ئەدەبدا هەیە، ئەو حیکایەتی گاڵتە و گەپەی جەوهەر و مەغزێکی قووڵی کۆمەلایەتی نییە و ڕەگ و ڕیشەیەکی ئەوتۆی لە ناو ژیانی کۆمەڵدا دانەکوتاوە، ئەویش هەر دەچێتە ڕیزی ئەدەبی ئامانجدارەوە، چونکە پێکەنینیش کە لە خۆیدا مەبەس بێت ئەویش هەر ئامانج و مەبەستێکی لەژیاندا هەیە و لە ئەنجامدا دەبێتە هۆ نەک مەبەس.

ئەدەبێکی هاوچەرخ دەگێڕێتەوە کە وا سەردەمێکی ژیانی خۆی لەگەڵ دەستە ئەدیبێکدا بردە سەر و ڕۆژێ چەند ساعەتێکیان بە قسەی خۆش و باسی واوە دەبردە سەر کە پێی پێکەنن و پێی ڕابوێرن بە خۆشی و شادی، ئەو ئەدیبە دەڵێ: هەر چەندە ڕۆژی چەن ساعەتێک پڕ بە دڵ هێندە پێدەکەنین کە تەواو بیچڕێین، بەلام وامان دەزانی کە کاتی خۆمان بە پڕ و پووچ و قسەی بێمانا و بێئامانجەوە دەبەینە سەروکاتی زێرینمان لە دەست خۆمان دەدەین، بەلام ئێستا کە لەوان دابڕاوم و دوور کەوتوومەوە، هێندێکیان مردوون و لە ژێز گڵدان،

ئێستا هەست دەکەم کە ئەو کاتە زێڕینەمان بەفیرۆ نەڕۆیشتبوو، ئێستا هەست دەکـەم کە پێکەنین شتێکی گرنگە لەو شتانەی کە پێویستی ئادەمیزادە و هیچ لە هەناسەدان و خواردن و خواردنەوەی جیا ناکەمەوە، ژیانی ئادەمیزاد بە بێ پێکەنین بە فیڕۆ دەڕوات و تارمایی ڕەشی و ناهومێدی بە سەر خۆیدا دەدا و وات لێ دەکا کە ئاسۆی فراوانی ژیان نەبینیت. چیرۆکی گاڵتە و گەپ و قسەی خۆش بەشێک لە ئەدەبی فۆلکلۆرە و خزمەتی خەڵک دەکا، چونکە ژیانی پڕ لە پێکەنین وێنەی ڕاستەقانی ژیانی بەختیارە، لە وتە و بەرهەمی شاعیران و نووسەرانی جیهاندا زۆر جار پێکەنین دەکرێ بەنیشانەی بەختیاری و خۆشبەختی و ژیانی پڕ لە پێکەنین دەکرێ بە ئامانجی کەسانێک کە هەوڵی شادی و بەختیارییانە.

زانـای پایەبەرزی کورد خوالێخۆشبوو مامۆستا عەلائەدینی سەجادی لە کتێبی «ڕشتەی مـرواری»دا سەبارەت بە قسەی خۆش دەڵێ: ئێمە نەتەوەیەکین و هەموو جۆرە ئەدەب و فۆلکلۆرێکمان هەیە، ئەو ئـەدەب و فۆلکلۆرەمان ئەگەر خۆشمان بڕۆین ئەوان ئەمێننەوە، کە ئـەوان مانەوە مانەوەی ئـەوان مانەوەی خۆمانە، چونکە نەتەوەیەک ئەگەر باوەڕ و زمانەکەی کەوتە سەر کاغەز و کەوتە بەر چاپ، ئەو نەتەوەیە لە ناوچوونی نابێت با بە هەزاران تاوێریش بپڵشێنرێتەوە، ئەمە ئەدەبە و کەلەپووری ئەدەبی ئێمە نابێ سەریان تێدا بچێ و لە ناو بچن.

ئەم قسە خۆش و نەستەقانە و ئەو گاڵتە و گەپانە کەلەپووری نەتەوایەتین و سوودیان لە ڕووی ئەدەبەوە بۆ نەتەوەکەیە، چونکە ئەدەب بناغەی نەتەوەیە، لە هەموو نەتەوەیەکدا، چ کۆن و چ تازە دەستەیەکی تایبەتی خەریکی زیندوو کردنەوەی ئەم کەلەپوورانە بوون و بەم شتانە، لەم ڕووەوە ناوبانگی نەتەوەیان بڵاو کردۆتەوە، ئەم قسە نەستەق و خۆشانە و ئەم شۆخی و گاڵتە و گەپانە مێژووی بەسەرهاتی نەتەوەیە، بەڵێ ئەمانە لە ڕواڵەتا زاخاوی مێشکن بەڵام هەریەکە دەرسێکیان تێدا هەیە کە پەندێکی لێ وەردەگیرێ.

هـەموو ئەدیبێک لـە هـەمـوو سەردەمێکدا و لـە نـاو هەموو

نەتەوەیەکدا چۆنیەتی پایەی ئەو نەتەوە دەر دەخا، هێندێک لەو ئەدەبە سەلیقەی تاکە تاکەی نەتەوەکە پێشیان دەدا، هێندێکی گوزارشت لە ڕابواردنی هەموو نەتەوەکە دەداتەوە، بە هەر دوو لایەنەوە پایە یەکی زیرەکی و زەوقی گشت نەتەوەکە پێشان دەدەن، نەتەوەکانی تر مایەیان زۆر بووە بۆ دروستکردنی ئەدەبەکەیان، ئەو مایە یەکە ئەوان بوویانە کوردە کە نەیبووە، لەگەڵ ئەوەشدا زەوقی تاکە تاکەی، یا هەموویان لە جموجوولا لە دروستکردنی ئەدەبەکەیان لام وایە کەمتر نەبووە لەوان، بۆیە وا دەڵێم چونکە نەتەوەکانی تر نیوەی سەرچاوەی ئەدەبەکەیان لە حوکمەوە هەستاوە، کورد ئەو حوکمەی نەبووە کەچی سەلیقە و زەوق و قەریحەی خۆی هەر زگماکی کۆگایەکی زێڕینی دروستکردووە، تاقانەی ناو تاقانە، دەستەگوڵی دیواخانە، مورووی دەستی نازدارانە، گوڵی دەستەی عەودالانە. کۆمەڵە ئەدەبێکی هەرە بەنرخن لە قسەی خۆش و نەستەق و ئەو دەماخ چاخ کەرانەی کە لە ئاسۆی خەیاڵێکی کوردییەوە گزنگیان داوە، بیری کوردی دەرگای دڵی خۆی کردۆتەوە، بۆنی عەتر و عەبیری تێکەڵاوی بای شەماڵی ژیریی کردووە، وەکو ڕووناکی بەری بەیان بە سەر دڵی خوێنەرەکان و بیستیارەکانیدا بڵاوی دەکاتەوە. ئەم قسە خۆش و نەستەقانە و ئەم گاڵتە و گەپ و شۆخیانە چەند بەرێکی بە کەڵکیان هەیە، یەکەم ئەدەبە و ئەدەب نەتەوەیە، دووەم ڕێبازێکە بۆ خوێندنەوەی کوردی، زۆر شت هەیە ڕێبازە، بەڵام ئەم وا لە مرۆڤ ئەکا پێوە بچێت و بیخوێنێتەوە و هیچ تاقەتیشی نەچێ، چونکە زاخاوێکە بۆ مێشک سێیەم وەکو لەش پێویستی بە حەسانەوە هەیە، فکر و مێشکیش ئەو پێویستییەی هەیە، حەسانەوەی فکر ئەوەیە کە خوشییەکی بگاتێ بەبێ ئەوە کە لەشەکە بۆی بکەوێتە عەزیەتەوە، ئەم قسە خۆش و نەستەقانە کە تۆ وەری دەگری خۆشییەک ڕوو دەکاتە فکر و مێشکت، لەگەڵ ئەم خۆشییە شا دەرسێکە بۆ هەموو ڕووداوێکی ژیان، کە ئەم دەرسە لە پشت پەردەی خوێندنەکەوەیە.

بێگومان ئەوەی لە هەموو شتێک پتر بۆتە هۆی ناوبانگی «سەیید ڕەشید» لە ناو شاعیران و نووسەرانی تری کوردا، قسە خۆشی

و گاڵته و گەپ و شۆخییەکانێتی، لەوانەیە لە ناو قسە خۆشان و کەسانی خاوەن قسەی نەستەق، شاعیرێکی تر و ئەدیبێکی تر بەم تایبەتمەندییە پەیدا نەکەین، ئەم چەشنە قسەی خۆش و شۆخی و گاڵته و گەپ و دەربڕینی ناسک و جوان و ئەدیبانە لە سەییدێکی شاعیر و بەهرەمەند و بەڕێزی وەکو «سەیید ڕەشید» لە جلوبەرگی ڕوحانی‌دا بە ڕواڵەتێکی ئاراستە و پاک و خاوێن و ڕیشی بڵند و سیما و ڕوخساری نوورانی و بەژن و باڵای ڕێکوپێک و کردەوەی سۆفیانەی زۆر سەرسوڕهێنەر بووە، «سەیید ڕەشید» عەمامەیەکی سەوز و پشێنێکی سەوزی زۆر جوان و خۆش ڕەنگی لە پشت بەستووە و لایەکی عەمامەکەی بە شانی‌دا بەرداوەتەوە و جەزابییەتێکی تایبەتی پێ‌بەخشیوە و هەر ئەم سیما و ڕوخسارە نوورانی و کەشم و نەشمە ڕێکوپێکە و خووی ڕەوشتە بەرز و جوانە و خوێن شیرینی و قسەی خۆش و نەستەق و پڕ لە گاڵته و گەپ، سەد ئەوەندەیتری لەبەر دڵان جوانتر و ڕەزاشیرین‌تر کردووە.

کەمتر هەڵکەوتووە کە کۆڕ و مەجلیسەکانی بەبێ کارەسات و ڕووداوێ بمێنێتەوە و قسەیەکی خۆش و شۆخییەکی بەتام و گاڵته و گەپی تێدا نەبێت و قسەخۆشەکانی و شۆخییە جوانەکانی و گاڵته و گەپ و جەفەنگە دڵڕفێنەکانی کۆڕبەکۆڕ و زاربەزار و شوێن‌بەشوێن گەڕاون و بڵاو بوونەتەوە.

لە ڕابردوودا زۆربەی شاعیران و نووسەران و ئەدیبانی وەکو خاڵەمین و هەژار و هێمن و شێخ محەمەدی شێخی بورهان و کەسێک نەبوو کە چەند قسەی خۆش و پڕ لە شۆخی و گاڵته و گەپی «سەیید»ی لەبەر نەبێت و لە کۆڕ و کۆبوونەوە و بەزمی شاعیران و ئەدیبان‌دا بە ناوی نەقڵ و نوقڵی مەجلیس نەیگێڕنەوە و بەهرەی لێوەر نەگرن.

بە داخەوە لەو کات و سەردەمەدا کەسێ نەبووە کە ئەم قسە خۆش و شۆخی و جەفەنگ و گاڵته و گەپانە کۆبکاتەوە و هەر بەم هۆیەوە زۆربەی ئەم گەوهەرە نایابانە لە دەست چوون و لە ژێر تۆز و غوباری زەمان و ڕۆژگاردا دەفن کراون و لە دەستدا نەماون، شایانی باسە کە «سەیید» جاروبار لە حزووری شێخی بورهانیش‌دا

شۆخی ئەدیبانە و قسەی خۆشی کردووە، ئەوا بۆ وێنە هێندێک لە قسە خۆ و نەستەقەکانی و شۆخی و گاڵتە و گەپەکانی لێرەدا تۆمار دەکەین:

**هێندێ لە قسەخۆشەکان و شۆخیەکانی سەیید**

جارێکیان شێخ ڕوو لە سەیید دەکا و دەفەرموێ: چابوو «چاوەش» ڕووت لەو دەرکەی کرد، دەنا دەبوویە موتەشەییخێک هەموو کەس بە ماڵێت مەحرەم دەبوو، سەییدیش دەم و دەست لە وەڵامدا دەڵێ: بەڵێ فەرمایشی شێخییە بەڵام قوربان منیش بە ماڵە هەمووان مەحرەم دەبووم.

جارێکیان سەرۆک عەشیرەتێکی مەنگوڕ بە ناوی «کاک پیرۆت» کە پیاوێکی خواناس و ئەهلی نوێژ و تاعەت و عیبادەت بووە، چەند سەر مەڕ لەگەڵ خۆی دەبا بۆ «خانەقا» بۆ ئەوەی سالیکان و مەنسووبانی خانەقا زیافەتێکی لێساز بکەن، شێخ لە سەیید دەپرسێ و دەڵێ: سەیید بڵێی کاک پیرۆت ئیحتیاتی کردبێ و ماڵێکی حەڵاڵی هێنابێ؟، سەییدیش لە وەڵامدا دەڵێ: بەڵێ قوربان یەقین بەشی ئاواڵ درانی لێداوە.

جارێکیان دەستەیەک لە عەشیرەتی مەنگوڕ دەچن بۆ زیارەتی شێخ و چون میوانەکان زۆر دەبن و وەتاغی خانەقاش جێگای ئەو هەموو میوانەی نابێتەوە، ناچار لە حەوشەی خانەقا ڕاخەریان بۆ ڕادەخەن «سەیید» دوای نوێژی شێوان بە تەنیشتیاندا دەڕوا و لێیان دەپرسێ، چۆنن؟ هیچوو کەم نییە؟ ئەوانیش دەڵێن: قوربان زۆر باشین بەڵام ڕەنگە لێفەمان کەم بێ و بەش نەکا، سەییدیش دەڵێ: نیگەران مەبن ئەگەر خۆم پێدادابن نایەڵم بێ لێفە بن.

جارێکیان «سەیید» لە سەردەمی فەقێیە تێدا لەگەڵ مامۆستا مەلا ساڵحی «حەریق» کە لە دێی «ساحێب»ی ناوچەی سەقز مامۆستای بووە بە تەنیشت مووچە و مەزرایەکدا دەڕۆن، هێندێ لە ژنان و کچان لەوێ شەتڵە تووتن دەچەقێنن، سەییدیش کە دەگاتە لایان سڵاویان لێدەکا و دەڵێ: ئەرێ ژنەکان، کچەکان بێم دەگەڵتان بچەقێنم؟!.

جارێکیان «سەیید» فەرمایشتی فەرمووە و خەڵکێکی زۆر

ڕاوەستاون و گوێیان بۆ فەرمایشەکانی گرتووە، مەلا محەمەدئەمینی فەرێک کە بە «فەریکەکەر» بەناوبانگ بووە لەم کۆڕەدا حازر بووە و یەکێک لە پشتەوە جارجارێکی بانگ دەکا و دەڵێ: «فەریک، فەریک»؟، مەلا محەمەد ئەمنیش زۆر تووڕە دەبێ، بەڵام دەنگ ناکا و چ ناڵێ، سەییدیش کە دەبینێ کابرا دەست بەردار نییە، ڕوو لە مەلا محەمەدئەمین دەکا و دەڵێ: عەمرت نەمێنێ دەتۆش وەڵامی بدە و بڵێ دەڵێی چی شەریک، شەریک؟!.

«سەیید» لە حوجرەکەی خۆی دادەنیشێ و سەماوەرەکەی ڕۆشن دەکا و لەو کاتەدا چەند کەس لە مریدان و مەنسووبان و زیارەتکەران دەچن بۆ دیدەنی و سەیید لەگەڵیان دەکەوێتە گفتوگۆ و قسە کردن و لە گەرمەی قسانداا بە یەکێک لەوان کە لە هەمووان جەوانتر و جحێڵتر دەبێ، دەڵێ: دا بابە هەستە فوویەک لەو سەماوەرە بکە بە قەرز، کوڕە لاوەکەش لە وەڵامدا دەڵێ: قوربان فوو چۆن بە قەرز دەبێ؟، سەییدیش دەڵێ: چۆن نابێ؟ دوایە فووت دەدەمەوە.

ئەدیبێکی وردبین و وشیارگێڕایەوە و گوتی: لەگەڵ دەستەیەک لە منداڵان لە مزگەوتی دێی «سەرا» خەریکی خوێندن بووین، سەیید ڕەشید تەشریفی هێنا بۆ ئەوێ و میوانی محەمەد ئاغای عەباسی بوو، چەند جارێک بۆ دیتنی مامۆستا و شاگردەکان هات بۆ مەدرەسە و هەموو جاریش نێوی یەک یەکی ئێمەی دەپرسی، جاری دوایی کە دیتی دیسان نێوی ئێمەی لەبیر چۆتەوە گوتی: کوڕینە بە خوا ناوناسمەوە مەگەر وەکو گیسکان ئاردەشێڵە و دە پشتی دەم.

جارێکیان سەیید لە حەوزخانەی خانەقا دێتە دەرێ، حاجی شێخ عەبدوڵڵای کوڕە گەورەی شێخ دەچێتە لای و ساعەتەکەی لە گیرفانی باغەڵی دەردێنێ و لە سەیید دەپرسێ و دەڵێ: سەیید ئی تۆ چەندە؟، سەییدیش لە وەڵامدا دەڵێ: قوربان ئیمن بستێکە، حاجی شێخ عەبدوڵڵا بەو وەڵامدانەوەی سەیید کەمێک تووڕە دەبێ و دیسان لێی دەپرسێ و دەڵێ: دەڵێم لەگەڵ ئیمن چەندی فەرقە؟، سەیید دەڵێ: قوربان وەک دەڵێن ئی تۆ قولانجێک درێژترە، ئەمجار شێخ عەبدوڵڵا بە تەواوی تووڕە دەبێ و بە سەریدا دەگوڕێنێ و دەڵێ: کوڕە ئەتۆ بۆ هێندە

ناحاڵیی، دەدەری هێنە و چاوی لێکە، سەیید دەڵێ: قوربان باوەڕم پێ بکە هەر ئێستا لە حەوزخانەی دەرمهێنابوو چاوم لێکرد شێخ عەبدوڵڵا بۆی دەردەکەوێ و دەزانێ کە سەیید مەبەست بە دەستەوە نادا و هەر پێی ناڵێ، ساعەتەکەی لە گیرفانی باغەڵی دەنێتەوە و بە بۆڵەبۆڵ و تووڕەیییەوە لێدەدا و دەڕوا و سەیید بەجێ دێڵێ.

شێخ محەمەدی کوڕی «شێخ» گێڕایەوە و گوتی: جارێک لە دێی شەرەفکەند ژنان دەوەیان دەکێشا، منیش منداڵ بووم و لەگەڵ وان هاتوچۆم دەکرد و جارجاریش یارمەتیم دەدان، سەیید لە دوورەوە چاوی بە من کەوت و بانگی کردم و گوتی: شێخ محەمەد چ دەکەی؟ کوتم قوربان لەگەڵ ژنان خەریکی دەوەکێشانێم، گوتی باشە بەڵام ئەو کارە بێ بەزم و زەمزەمە نابێ، ئەگەر گەڕایەوە بچۆ ئەو شیعرانە لە بەر کە و بە گۆرانی بیانڵێ:

**من بە مەسەڵ دەروێشم  موغتەنیمی بڕوێشم**
**نایبی کەر قەڵێشم  مودخیلی پاش و پێشم**
**هەشتێکی بێتە پێشم  لاڕەددەتێی دەکێشم**
**ئەمڕۆ دەوەی دەکێشم  سبەی دەوەی دەکێشم**

شێخ محەمەد کوڕی «شێخ» دیسان گوتی: سبەینەیەک زوو چوومە حەوزخانەی دیتم سەیید لەوێ خەریکی دەستنوێژ هەڵگرتنە، منیش نیازم بە غوسڵی جەنابت بوو، گوتم: ئەرێ «کاکەڕەش» بۆ ئەو بێگارەم لە باتی ناکەی؟ کاکەڕەش «سەیید» لە وەڵامدا گوتی: ئەدی بە قوربانت بم بۆ بێگارەکەی دیکەم پێناکەی؟

دیسان شێخ محەمەد فەرمووی: لە ماڵێ ژێرپیاڵەمان کەم بوو، ناردمە لای سەیید ژێرپیاڵێکمان بۆ بنێرێ، گوتبووی بە شێخ محەمەد بڵێن ئەویش «ژێری» زۆرە ئەگەر ئەو ژێرێکی بۆ ناردم، منیش ژێرپیاڵەیەکی بۆ دەنێرم.

خوالێخۆشبوو «مەلا ئەحمەدی تەوحیدی» کە لە قسە خۆشانی بەناوبانگی مەهاباد بوو، گێڕایەوە و گوتی: دەگەڵ دۆستێکم چووبووینە «خانەقا» بۆ زیارەتی شێخ، دەوری پەهلەوی بوو، هەر

مژگان تو عسکر سیاهند    در پاس رخت چه خوش سیاهند
دو چشم تو مست و شوخ و شاهد    بر کشتن صد چو من گواهند
زلف تو شب فراق عاشق    دو روی تو دو هفتهٔ ماهند
خورشید تو بامه دو هفته    در روز نه جای اشتباهند
قاصد نه همین دلست و جانم    در راه توپیکم اشک و آهند

هر چند نمی‌کنی تو یادم
با یاد تو من همیشه شادم

ای یار نگویمت که ماهی    مه را نبود به سر کلاهی
برزمرهٔ مهوشان تو ماهی    نی‌نی غلطم که قبله گاهی
شمشادی به قدّ و کس ندیده است    شمشاد که بگذرد به راهی
بالای تو سرو و این عجب‌تر    بر سرو نشسته است ماهی
آهم به فلک رسید و اشکم    خواهد که فرو رود به ماهی

هر چند نمی‌کنی تو یادم
با یاد تو من همیشه شادم

مژگان تو خود سیاه رنگ است    با خاطر خستگان به جنگ است
بر حال دلم بسوخت هر دل    الاّ دل تو که خاره سنگ است
سیمست نهان به سنگ و از تو    تن سیم و دراودل چو سنگ است
مژگان تو بی‌کمان ابرو    هر یک به مثل یکی خدنگ است
دل دارم و جان سپردم اکنون    از یاری مات عار و ننگ است

هر چند نمی‌کنی تو یادم
با یاد تو من همیشه شادم

باز آی که تا برت بمیرم    شاید بقیامتت بگیرم
روی تو بگفت که شاه حسنم    ابروت بلی که من مشیرم
دو چشم تو ترک بی‌عرق مست    گوید زقنت که من سبیرم
زلف آمد و گفت من کمندم    زد غمزه قدم که شیر گیرم
بازآ و بکش مرا که هرگز    بر کشتن خود ترا نگیرم

هر چند نمی‌کنی تو یادم
با یاد تو من همیشه شادم

چشم تو بگفت من اسیرم ابرو و مژه است تیر و شیرم
آن غمزه دوستم چو حجاج باز آمد و گفت من وزیرم
جان رفت برش که من فدایم دل گفت بلی که من امیرم
صد شکر که در کمند زلفم چاه زنخش بود سبیرم[1]
خطّش چو دمید گفت زلفش شد دلبری از کفم که پیرم

هر چند نمی‌کنی تو یادم
با یاد تو من همیشه شادم

ای روی تو در جهان گل من آسایش و راحت دل من
بازآو بکش که در فراقت شد رشک سعیر منزل من
در وصف گل تو نیست «چاوش» بلبل به مثابه دل من

هر چند نمی‌کنی تو یادم
با یاد تو من همیشه شادم[2]

«۱» سبیر: نام چاهها هادیه متعلق به تمیم رباب.
«۲» از آخر بند این ترجیع بند فقط این سه بیت باقی مانده بود.

سەیید لە دانان و نووسینی مەسنەویشدا شارەزایی و کارامەیی خۆی نیشان داوە و بە جوانترین شێوە و بە بەرزترین ناوەرۆک مەسنەوی هۆنیوەتەوە.

سەیید ئەو مەسنەوییەی خـوارەوەی بۆ یەکێک لە فەقێکانی پێشووی خۆی بە ناوی «میرزا عەبدوڵڵا» «مصطۆ»ی کوڕی کوێخا مەحموود نووسیوە و بە شێوەی نامە بۆی نـاردووە. سەردەمێک ئـاوایی «ڕەحـیـمخـان» لە بەیعولشەرتی جەنابی شێخدا بـووە و کوێخا مەحموود لە لایەن شێخەوە سەرپەرستی کاروباری ئەم دێیە و نوێنەری کۆکردنەوەی بەرهەم و حاسڵاتی ئەم دێیە بووە، بەڵام خۆی لە ئاوایی گوێکتەپەی نزیک ڕەحیمخان نیشتەجێ بووە و میرزا عەبدوڵڵاش لەوێ هەر لەگەڵ باوکیدا ژیاوە.

سەیید ئەم فەقێیەی خۆی واتـە مـیرزا عەبدوڵڵای زۆر خۆش ویستووە چون وەک دەڵێن میرزا عەبدوڵڵا ئینسانێکی زۆر زانا و بلیمەت و زیرەک و وریا و لێهاتوو بووە و شێخی بورهـانیش هـەر زۆری خۆش ویستووە، سەیید بە جۆرێکی میرزا عەبدوڵڵا خۆش ویستووە، ئەو نامانەی کە بۆی نووسیوە ئینسان دەخاتەوە بیر و یادی خۆشەویستی نێوان مەولانای ڕۆمی و حیسامەدینی چەڵەبی، بە پێچەوانەی ئەوە شەوە لە نامەکانیتریدا کە بۆ سەرۆک عەشیرەتەکان و دەسەڵاتداران و ساماندارانی ناوچەی نووسیوە، توانج و تانە و تەشەری لە هەموان داوە و لۆمە و سەرزەنشتی کردوون.

سـەیـیـد تـا کـۆچـی دوایـــی کـــردووە ســەبــارەت بــەو دۆســتـە خۆشەویستەی هەر بە وەفا و بە ئەمەک بووە و لەم دواییەدا کە میرزا عەبدوڵڵا لە دێی «حەمامیان» دانیشتووە و بووە بە نووسەر و میرزای مەحموود ئاغای ئیلخانی و کاری نامەنووسین و نامەکاری و پەروەردە کردن و بارهێنانی منداڵەکانی ئەوی وەئەستۆ گرتووە، ئەگەر جاروبار بە هۆی ئیش و کارەوە نەیتوانیوە بچێ بۆ لای سەیید و بیبینێ، سەیید خۆی چووە بۆ دیدەنی و هەر چەند زۆر بە کەمی لە خانەقا وەدەر کەوتووە و چووە بۆ سەفەر، بەڵام جاروبار چووە بۆ

دێی «حەمامیان» و چەند ڕۆژێک لە ماڵی میرزا عەبدوڵڵا ماوەتەوە.
هەر وەکو گوتمان میرزا عەبدوڵڵا خۆی پیاوێکی زانا و بلیمەت و خۆشخەت و خاوەن خوو ڕەوشتی بەرز بووە و هەر وەک لە نامەکانیەوە دەردەکەوێ شێخی بورهان زۆری خۆشویستووە و لە تەریقەتیش بێبەهرە نەبووە، بەڵام بەر لەوەی خوێندن تەواو بکا، ژنی هێناوە و ئەوەش پێچەوانەی فەرمان و ڕاسپێری شێخ بووە، کە بەرهەڵستی کردووە لە ژنهێنانی سالیکانی ڕێگای تەریقەت بەر لە گەیشتن بە پلەوپایەی بەرزی خواناسی و تەسەووف، هەر بەم هۆیەوە «سەیید» لەو مەسنەوییەی خوارەوەدا میرزاعەبدوڵڵا دەخاتە بەر تانە و توانج و تەشەر و لۆمە و سەرزەنشتی دەکا:

**بشنو از «چاوش» حکایت میکند — از فراق تو شکایت میکند**
**چون نشد کاری میسر از وکیل — رفتم و بگریستم پیش کفیل**
**گفتمش ای خاطر ما را معین — جان ما را هم زمان و همنشین**
**در غم و شادی توئی ما را رفیق — الرفیق آمد بلی ثم الطریق**
**ای سمّی حضرت مهتر خلیل — تو کفیلی و مرا نعم‌الوکیل**
**با شدت بر جان ما زینروشرف — بار دیگر وا خریدی از تلف**
**سوی تو آورده‌ام از غم پناه — خود مرا زین روز عاجزتر مخواه**
**خیز و بگریز و منیدیش از سفر — رو بر آن دلربای خیره‌سر**
**رو بر آن دلبر شیرین کلام — از زبان «چاوش» گم کرده نام**
**عرضه کن احوال «چاوش» را تمام — در رکابش باش و بازآ والسلام**
**عذر او می‌نوش و اهل حزم باش — تو کفیلی مرد بزم و رزم باش**
**حلیه پرداز است آن شیرین پسر — عارف انداز است در هر رهگذر**
**عرض او کن کای نگار سنگ دل — بلبلت افتاده‌اندر خاک و گل**
**عالمی از گریه‌اش دارد هراس — دارد او در گریهٔ خود انغماس**
**جز تو غمخواری ندارد در جهان — همچو تو یاری ندارد بیگمان**
**درد او را روی تو باشد دوا — جز ترا هرگز نخواهد از خدا**
**زود شو او را زغم آزاد کن — یا بکش یا خاطرش را شاد کن**

«سەیید» لێرەدا نامەکەیە بەخشان درێژە پێ دەدا و دەنووسێ:

در همین روز جمعه بیست‌وهفت شهر شعبان یکی از صدور ثقات زمان، و بلد از قوه جاذبه زنان، در گوش چاوش کشید که ای سفیه مسمّی به رشید، وی در علم مکاید دوستان زمانی و زنانی بلید، مگر نمی‌دانی که یارت را این همه تأخیر از چیست و مایهٔ این همه تعصیر از کیست؟ ای خاک عالم بر سر نادانیت، پاشان دەگەڕێتە سەر هەڵبەستە فارسییەکە و دەڵێت:

**تف بر این دانش که تو داری بسر — گل بر این بینش که تو خوانی بصر**

**یار را سودای زن اندر سر است — سینه او دختری را مجمر است**

**علم را از بهر او زد بر زمین — شد عری از نسبت مولای دین**

**علم را از بهر او در چاه کرد — رشتهٔ نسبت هم او کوتاه کرد**

**علم را او کرد یکسر پایمال — شد حنای پرچم او علم حال**

**علم و دینش در ره او شد هبا — آن واینش مژده پیک سبا**

**خاطرش در قید او محبوس شد — دوستان را دل از او مأیوس شد**

**ای سبکساربری از عقل و هوش — عبرتی برگیر و خود دیگر مکوش**

**نامه را مفرست پی کن اسب پیک — تحفه‌دان این بنده را منی الیک**

**گر نپرسی تو دگر ماذاعلیک — خود نگه‌دار این امانت را لدیک**

**گفتمش الصدق مخبوءلدیک — راست گفتی رحمت‌الله علیک**

**رحمت حق بر روان پیر ما — آفرین بر پیر پر تدبیر ما**

**شمس‌دین آن منبع علم لدن — یخلق الله مایشالو قال کن**

**کس نمی‌داند چواو آفات زن — پس سمعنا گوی و دیگر دم مزن**

**علم او علم الیقین آمد نه‌ظن — گفتم از دنیا که چه بود؟ گفت زن**

**آن بود ام‌الخبائث ای رفیق — بی زنی شرط است مرا اهل طریق**

**آری آری یار ما را زن ربود — جان ما را عشوه زن از تن ربود**

**تا که او را پای در زنجیر شد — پند ما را پیش او تأثیر شد**

**تا که آن صیّاد ما نخجیر شد — صید بی صیّاد او بی پیر شد**

**آنچه با ما کرد زن فریادرس — خود ندیده است و نبیند هیچ‌کس**

**بلبل بیچاره نالد از قفس — مار بگریزد ز گلبانگ جرس**

**صدمهٔ سیلاب را خورده است خس — عنکبوت هم می‌تند بال مگس**

**قوم صالح ناقهٔرا زد بر زمین — اهل طایف زد به شاهنشاه دین**

**کشتن حجاج سگ ابن زبیر — ظلم او هم بر سعید ابن جبیر**
**کرد اسیر آل پیمبر را یزید — شد عذابش لاجرم از حد مزید**
**آنچه دید از اهل بسطام بایزید — می‌زنند راه مریدان را مرید**
**یاد کن از پشّه و باد شدید — هکداء عمر تو بادا بر مزید**
**هر چه بگذشته است و آید درزمن — شمّه‌ای از ظلم زن باشد به من**
**آنکه زن را در ازل فرمود زن — کاش آن جلاّبه را گفتی مزن**
**حق که‌وی را پیش از این گفته است — زن من کجا گویم به یار من نزن؟**
**هر که کرد آن یار را از من جدا — جان او را حق کند از تن جدا**
**بارها می‌گفتمت کای جان من — دست من دامان تو برزن متن**
**شیوه‌ی یونانیان آموختی — محنت و رنج و زیان اندوختی ۱**
**خیز و بازآو و مخورکید زنان — خانه‌دانی خود مزن بر خایه‌دان ۳**
**خویش را بر دلق شیطان دوختی — جان ما را زآتش غم سوختی ۲**
**پند «چاوش» را چو در در گوش کن — شربت مرد خدا را نوش کن**
**دامن شمس هدی را تندگیر — از جوانان بگذر و مگذار پیر**

میرزا عەبدوڵڵا بە پێی ئەو نووسراوەی کە لە پشتی یەکێک لە نامەکانی «سەیید»دا نووسیویەتی، لە هەشتەمی ڕەبیعول ئەوەڵی ساڵی «**١٣٤٦**»ی کۆچی مانگی لە ئاوایی «کولتەپە»وە چووە بۆگوندی «حەمامیان» و دوای چەند ساڵێک دووبارە گەڕاوەتەوە بۆ دێی کوڵتەپە و کۆچی دوایی کردووە و لە خانەقا بە خاکیان ئەسپاردووە.
«سەیید» لە نامەیەکی‌تردا کە بۆ دۆستێکی نووسیوە دەڵێت:
روز چهارشنبه یازدهم شعبان چون خبری از آن دوحهٔ اعتدال و گلبن گلزار خیال نیافتم، لاجرم بعنوان فال جهت تسکین حال‌وبال مترنم این مقال گشتم:

**مرحبا ای گلبن بستان ناز — مرحبا ای نونهال باغ راز**
**مرحبا ای نوجوان تازه رو — ای گلستان را زرویت رنگ و بو**
**ای نهال قامتت سر و سهی — ماه خوبانی و بر ایشان مهی**
**مرحبا ای صبر و آرام دلم — خیر مقدم ای چراغ منزلم**
**ای وصال تو صفا اندر صفا — وی فراقت محنت و جوروجفا**

مرحبا ای معدن حسن و جمال — مرحبا ای طوطی شیرین مقال
ای گل سنگین دل سیمین بدن — چند باشم بی تو زار و ممتحن
وعده فرمودی که می‌آیم برت — نامدی ای من به قربان سرت
روز و شب در انتظار مقدمت — گوشه‌گیرم می‌کشم بنگ غمت
خلق حیرانند از بی‌باکیم — بر ملا گویم که من تریاکیم
پیک را بیخود به راه انداختی — جان ما را در بلا انداختی
تو بحق پیر برهان شمس دین — رحمتی کن بر دل اندوهگین
تو بحق جمله یاران خدا — خیز و بازآو و مشود دیگر جدا

دردسر دادم ترا از قیل و قال
یاحبیبی قم فقد ضاق المحال

دسیان له وتوویژێکی دڵدارانه و ئەویندارانەدا ڕووی دڵی له یار دەکا و دەڵێت:

گوش کن تا عرضه دارم درد دل — شمّه‌ای از سوز و آه سرد دل
بلبل روی توکان رشک گل است — از گل و گلزار و بلبل غافل است
دل به مهرت آنچنان پا در گل است — کی ورا پروای سرو و سنبل است؟
زآن زمان کش مهر رویت در دل است — میل گل بر جانش سّم قاتل است
در هوای روت گرید زار زار — باشد اندر دیده‌اش گلزار زار
بی‌تو در کنجی خزیده همچو بوم — دورتر از همگنان زار و ملوم
دارد اندر سینه از تو خارخار — گل بود در چشم او چون خارخوار
رفتن صحرا و سیر مرز و بوم — بی‌جمال یار پندارد مشوم
روز و شب بگرفته کنجی بوم وار — می‌نیارد کرد خود را آشکار
باشد از یاران جانی هم نفور — کس نمی‌یارد کند پیشش عبور
ای سرم بادا به قربان سرت — جان به قربان غبار معبرت
رحمتی کن بر دل حیران من — ای به قربان تو هر دم جان من
بلکه آرامی بیابد یک نفس — خیز و بازآو و ورا فریاد رس
چون به پای تو ندارد دست رس — دست بر سر می‌زند همچون مگس

هجر تو ناراست و دل بیچاره خس
دل بجان آمد زجورت جور بس

ئەمجار خۆی لە زمانی یارەکەیەوە وەڵام دەداتەوە ودەڵێت:

**گر رود از مرگ تو پنجاه سال — زنده گرداند ترا بوی وصال**
**گر کنم یک لحظه بر گورت گذر — خود بر آری زودتر از خاک سر**
**وربرت آیم در آغوشم کشی — می‌نگنجی درد و عالم از خوشی**
**یا برت آیم در آغوشت کشم — بنده سازم حلقه در گوشت کشم**
**گر گزارم یک نفس بر لب لبت — رشک روز عیش گردانم شبت**
**بیدریغ از بوسه‌ای شادت کنم — بعد ویرانیت آبادت کنم**
**دست خود در بین دو دستت کنم — زین سبب حیران و سرمستت کنم**
**گویمت ای عاشق مفتون من — خسته دلداده و محزون من**
**«چاوش» آشفته و مجنون من — ای سرشکت دجله و جیحون من**
**ای رئیس جملهٔ اهل وفاق — کیف حالک یاحبیبی فی‌الفراق**
**حال تو چون بود در هجران من؟ — جور کردم از تو ای حیران من**
**ای سر و سردار ارباب وفا — عفو کن کز حد بدر کردم جفا**
**شاد باش ای خستهٔ آزار من — ای رواج دکهٔ بازار من**
**شاد باش ای خستهٔ تیر جفا — کآیدت از من صفا اندر صفا**
**شاد باش ایندم که من آن توام — من بعد من لقمهٔ خوان توام**
**من بعد من خلعت شان توام — یار و یاور جان و جانان توام**
**زین‌سرا، سرزان سرایت سرورم — تخت و بختم من ترا تاج سرم**
**یار و غمخوار توام ای غم سرا — پس غم ما را بگو ای غم سرا**
**باش اندر جنت وصلم مقیم — من بعد مندیش از نار حجیم**
**فرقت ما بودای یار حمیم — بر تن و جان تو چون ماءحمیم**
**از فراق مارها گشتی بدان — وصل ما آمد ترا دارا لامان**

**وصل ما باشد ترا درالسلام**
**همین مگو از فصل دیگر والسلام**

هەروەها لە وەڵامی نامەی یەکێک لە دۆستەکانی‌دا کە بەڵێنی بە «سەیید» داوە دوای چەند ڕۆژێکی تر دێت بۆ لای، دەفەرموێت:

**مرا آن گلبن بستان خوبی**<br>**نهال باغ محبوب القلوبی**

**جمال دلبری و دلربایی**<br>**کمال پر دلی و پخته‌رایی**

**فروزیب گلستان صباحت**<br>**صفای باغ و بستان ملاحت**

**کساد دکهٔ شکر فروشان**<br>**خمار افزای بزم باده نوشان**

**چراغ محفل باریک بنیان**<br>**اسیر چنگل تاریک بنیان**

**خبر فرمود کای دلدادهٔ من**<br>**دمادم مست و محو بادهٔ من**

**اسیر پرچم زنّاروارم**<br>**فقیر حسن بیحد و شمارم**

**اسیر پیچ زلف شیر گیرم**<br>**فقیر و هیچ حسن بی‌نظیرم**

**اسیر طرهٔ پر پیچ‌وتابم**<br>**فقیر حسن بیرون از نصابم**

**هزار و بلبل باغ جمالم**<br>**رواج افزای حسن بی‌مثالم**

**هلال دوری رخسار ماهم**<br>**مسوز از ناله کم زن تیرآهم**

**که من اعجوبهٔ جمع بتانم**<br>**گهت جان می‌دهم گه جان ستانم**

**به غمزهٔ قاتل ارباب دردم**<br>**ببوسه می‌کنمشان زنده دردم**

**به غمزه قابض ارواحم امروز**<br>**به لب صهبا و روح و راحم امروز**

**به غمزه قاتل ارباب شوقم**<br>**به بوسه زنده ساز اهل ذوقم**

**به غمزه فتنهٔ انسانم این دم**<br>**به لب سرچشمهٔ حیوانم این دم**

**به غمزه ماحی اهل نیازم**<br>**به بوسه نشهٔ ارباب رازم**

**کنونت می‌دهم از خود نویدی**<br>**بمیر از شادی ارمرد رشیدی**

**پس از رنجی که از فرقت کشیدی**<br>**که بی من شربت محنت چشیدی**

**پس از چندی دگر آیم بسویت**<br>**دهم دوباره آب و رنگ رویت**

**پس از دردی که از هجرانت دادم**<br>**پس از داغی که بر جانت نهادم**

**چنان تنگت همی آرم در آغوش**<br>**به هوش آیی شوی دوباره مدهوش**

**چکانم بر لبت از چشمهٔ نوش**<br>**یکی دو قطرهٔ تا سازی فراموش**

**هموم و غصهٔ و اندوه ما را**<br>**جفا و محنت انبوه ما را**

**الا ای محنت هجران کشیده**<br>**الا ای شربت حرمان چشیده**

**ترا دست طمع از ما بریده　　ترا باز امل سویی پریده**
**زداغ ما زجان و دل رمیده　　به ناچاری به کنجی آرمیده**
**مشو آشفته و خوش باش و شادان　　که بعد از چند آید در برت جان**
**تنت را باز جانی در برآید　　روانت را روان دیگر آید**
**بشارت ده که هجرانت سرآمد　　نگار پاک دامانت سرآمد**
**چو دیدم دلبرم از در درآمد　　تو گویی جانم اندر پیکر آمد**
**جفا و جور هجرانم سرآمد　　روانم را روان دیگر آمد**
**بگفتم از طریق شوق و شادی　　چو دیدم در درون خودگشادی**
**بحمدالله خلایق الرشادی　　که رستم از قیود نامرادی**
**نگار نیا تو بهر مرده جانی　　غلط گفتم که وحی آسمانی**
**مگر تو آیتی بودی زرحمت؟　　که بر بودی زجانم گرد زحمت؟**
**الهی وصل را پاینده گردان　　به نور خود دلم را زنده گردان**
**مکن زین بیشتر از خود جدایم　　بسوی خود در رحمت گشایم**
**الهی بستهٔ پندار خویشم　　اسیر فکر ناهموار خویشم**
**وجودم را زجود خود فناده　　به ذات پاک خود آن دم بقاده**
**به قید بغض عمر و حب زیدم　　گرفتار کمند کید و شیرم**
**خداوندا به حق پیر برهان　　مرا زین نمس شیطان پیر، برهان**
**مکن آواره از دربار خویشم　　مکن دیگر جدا از یار خویشم**

**خدایا «چاوش»م بی دستگاهم**
**بجز فضل تو می‌نبود پنام**

هەروەها لە نامەیەکی تردا دەنووسێت:

قوربانت گردم اوقاتی که سرکار وکیل آنجا می‌بود حیوان «قاورمه» را باز آورده بودند و تراکم نعم و ترادف ارزاق بود، خیال می‌کردم که این مائدهٔ از آن اوست و همین خوان بیدرنع علامت و نشان اوست نه نشان من، و الا شأن من حیله و دروغ است و خوان من ریزه و دوغ است، خود غلط بود آنچه ما پنداشتیم، منظور از تحریر این همه خیالات فاسده و تعریض امتعهٔ کاسده همین است که بابت دکان من یاد شما است و متاع بازار من مراد شما است.

مرا در دکهٔ دل غیر یادت
به بازار خیالم جز مرادت

نیاید خود متاع دیگر ای دوست
که ملک توست شهر پیکرای دوست

نبینم در جهان هرگز جمالی
نیاید در دلم از کس خیالی

که باشد دیده‌ام صورت سرایت
مزیّن از غبار زیر پایت

غمت را دل بود خود حجلهٔ ناز
درش بر روی کس هرگز نشد باز

مرا جز روی تواندر نظر نیست
اگر باشد نبی نوع بشر نیست

مرا جز یاد توکاری نباشد
ترا چون من خریداری نباشد

مرا جز فکر تو در دل نپاید
گر آید یک نفس در وی نیاید

چو نفسم گرچه یکسر نقص دینی
همیشه با روانم همنشینی

چنانم در درون دل‌نشینی
که گوئی نقطهٔ خط اللعینی

مرا جز یاد تو نبود به خاطر
مگو کذب است و لاغ الله حاضر

بیا بهر خدا ای شوخ مهوش
گذر کن پس نظر کن سوی «چاوش»

**نامۀ اول:**

**ای سـر «چـاوش» بـه قربان سـرت جـان و دل سـر گـرد خـاک معبرت**
**گفتـه بـودی در یکـی از نامه‌هـا بـاش کایـم چنـد روز دیگـرت**
**روزهـا شـد هفتـه و شـد ماه سـال کـم نشـد از چنـد روز دیگـرت**

قربانت گردم: محرره روز دوشنبه دوم ماه مبارک شعبان در حمایت «صالحه‌زله» زیارت شد، از دیدن پاکت رغشه بر اندام افتاد و خاطر محنت مظاهر را هوای طپیدن ظاهر شد که یارب در این چه حکمت است که من قاصد را فرستاده‌ام که تشریف را بیاورد و او تعلیقه را می‌نگارد؟ در حضور مرحمت ظهورشاه مشکل‌گشا حضرت مستطاب مولی روحی له‌الفدا باطناً بنای ذلت و زاری نهادم که از خواندن تعلیقه دچار غم و محنت نشوم، گرفتار خلاف مأمول دیرینه نیابم.

**یارب سببی ساز که یارم بسلامت باز آید و برهاندم از چنگ ملامت**

از توقف قاصد هم هوای یأس را بخاطر راه نمی‌دهم که انشاءالله تعالی طول مکث قاصد، دلیل حصول مقاصد است و به زبان حال و قال بعنوان فال، برخلاف ماضی مطابق حال، مآل را بخیر استقبال میکنم و علی‌الاتصال مترنم این مقالم:

**عسی‌الکرب الذی امسیت فیه یکون و رائه فرج قریب**

والحاصل، صباح را در این حالت به مساء بر دم و مساء را باز به صباح سپردم.

**گهـی زامیـد می‌رفتـم بـه افـلاک ملـک گفتـی مـرا کالله هنـاک**
**گهـی از بیم می‌کـردم به سـر خاک مـرا بر دیده مـی‌زد خار و خاشـاک**
**بیـا ای دلربـای شـوخ و چـالاک بکـن کاری کـه دل از غم شـود پاک**
**بیـا ای دلبـر سرمسـت بیبـاک کـه از داغ توام شـد سـینه صد چاک**
**بیـا جانـا بحـق شـاه لـولاک حیاتـم تـازه کـن الله حیـاک**
**بـه غمـزه خوانمـت حجّاج سـفاک ز لعلـت منفعـل گـردم له حاشـاک**
**بـود زلفـت بتـر از مـار ضحّـاک و لیکـن داری انـدر لعـل تریـاک**
**غم و انـدوه فرقـت خار و خاشـاک بسـوزد دلوبـدا نـور محیّـاک**

**خوشـا کآیـی و «چـاوش» روی بـر خـاک**
**کنـی رویـش بـه رحمـت زآب و گل پـاک**

**نامۀ دوم:**

«سەیید ڕەشید» ئەم نامەیەی بەم سەردێرە «قوربانت شوم بازآ قربانت شوم» دەست پێکردووە و بە هۆی دوو دێرە شیعری یەکەمی نامە بە شێوەی مەتەڵ و داخراو ئیشارەی بۆ ئەم عیبارەتە کردووە:

**قـربـانـت شـــوم بـــازآ قـربـانـت شوم**

| | |
|---|---|
| **در کلام حــق الــف باتـا بخـوان** | **هیــن مشــو آشــفته و بـاز آمــران** |
| **در کلام حــق الــف بانـا شــنو** | **خیــز و بـازآو و مــرو شــیدا مشــو** |
| **یـا بُنّــی اژکَــبْ ســرایم نــوح وار** | **تانگــردی همچــو کنعان خــواروزار** |
| **از ســآوی کارهـا گــردد تبـاه** | **مــن رحــم نبــود مگــر در خانقـا** |
| **پیر مـا نوح اســت و کشــتی صحبتش** | **نفــس مـا کنعــان و طوفــان غفلتش** |
| **شــهوت و کــردار مـا کــوه بلنــد** | **پنــد نــوح ار شــنوی افتــی بــه بند** |
| **گــر بدقــت بنگــری لاعاصــم اســت** | **کشــتی اکنون باز و مولا راحم اســت** |

**قربانت شوم:**

مدت مهاجرت دراز کشید و حالت مصابرت فراز، نه از جانب شما پیغامی است که دل را از او آرامی بهم رسد و نه در مقابل رسایلم جوابی است که بر آتش دل آبی ریزد و نەنسیمی که بر سرما خاکساران خاکی بریزد:

**ای وای زبــی مهریــت ای شــیخ جفاکیــش**
**در هجــر تــوام خســته و افســرده و دل ریــش**
**تـا چنــد کشــم بـار خطـا و غــم و تشــویش؟**
**روزم شــب و در شــب تب و در تب خورمنت نیش**
**بـازآو بکــش بهــر خــدا و مبــر از خویــش**

هنوز در مقابل رسایل جوانی نرسیده است رسالۀ دیگر را مهیا میدارم چکنم که نکنم بی‌اختیارم، قربانت شوم از قراری که مشاهده می‌شود از خستۀ خود دست‌بردار شده‌اند اگر خدای نخواسته چنین بوده باشد می‌خواهم که گناه خود را بدانم، به خدای واحد بسوای مهربانی زیاد و تأسیس بنیاد و داد و تحکیم و ثأکید بنای اتحاد، قصوری گمان نمی‌برم، بلی بلی اینقدر هست و آنهم در اختیار من نیست، شاعر فرموده است:

**ز دوری تو نمردم چه لاف زنم**
**که خاک بر سر من باد ومهربانی من**

دراین هم که اختیاری نیست بدین ابیات مولانای جامی «قدس سره» اعتذار نموده به مراحم و گذشت حضرت مولی روحی فداه که در آن بحر بی‌ساحل و کنار، جسارت و سوء ادب و اینان و یونانیان قطره به دریاست، یاچون زمین و غبار است، استشعاع مینمایم که از این گناه ناکرده ما را صدقهٔ همان دندان شکسته نموده عفو فرمایند، که العفو عندالقدره:

**مانده‌ام از یار دور و زنده‌ام زین گنه تا زنده‌ام شرمنده‌ام**
**برده‌ام لاغر تنی پیش رقیب استخوانی پیش سگ افکنده‌ام**
**بندگان داری سگان هم نیز و من بندگان را سگ، سگان را بنده‌ام**

والسلام

**نامهٔ سوم:**

**در غیرتم از صبا که هر گه و بیگه گستاخ رود بکوی آن زیبا مه**
**او میرود و من ازقفا می‌گویم گریان و لَیْتَنی کُنتُ معه**

قربانت شوم هر بار که بی‌غبار رعونت و استکبار، مکتوب شریف بر اسلوب لطیف از جانب دلدار منیف متضمن التفات خاطر خطیر بحال بندهٔ حقیر فقیر و فرحبخش دل غمدیده و راحت رسان سینهٔ جراحت کشیده می‌گردد و هر ذرّه از ذرّات وجودی زبان حال می‌گشاید و این ترانه از مقام تضرّع و ابتهال می‌سراید:

**من کیستم که نامه‌نویسی به سوی من؟**
**در طی نامه درج کنی آرزوی من؟**
**این دولتم بس است که گوش رضا نهی**
**گاهی که قاصد بکند گفتگوی من**

و علیهذاالقسط گستاخی ارسال نامه و خط مبنبی از معنی نزاع و التیاع و ادراک سعادت اتصال و اجتماع مظنه اخلال بحسن ادب و تجاوز از دأب ارباب طلب می‌نماید، لاجرم خرق حجاب عادت کرده و روی در قبلهٔ صدق و ارباب ارادت آورده می‌گوید:

**جانـا طلـب وصـل تـو نتـوان کـردن**
**زیـن پـس مـن و خـون دل پیاپـی خـوردن**
**جـان را بخیـال روی تـو پـروردن**
**شـبهای دراز را بـه روز آوردن**

چون سخن به اینجا رسید خامه خشک ایستاد و نامه بر خود پیچید، آری چه توان کرد؟، آنچه مقصود است در عبارت نمی‌آید و آنچه در عبارت می‌آید ادای مقصود را نمی‌شاید:

**آن بـه کـه بـه لـب مهـر خموشـی بنهیـم**
**و زدرد سـر خامـه و کاغـذ برهیـم**
**دانیـم کـه از دوکـون مقصـود یکـی اسـت**
**فـارغ ز دوکـون دل بـه مقصـود دهیـم**

مقصود از این همه گفت و شنود آگاهی است به مقصود، هر که را از این دولت ارزانی داشتند اگر هیچ ندارد همه دارد و هر که را از او محروم گذاشتند اگر چه همه دارد هیچ ندارد، هوشمند آگه می‌یابد که همهٔ اوقات را به تحصیل سبب آگاهی معروف دارد و همهٔ انفاس را به تقویت و تکمیل آن موقوف گرداند:

**گـدای کـوی آن مقصـود را میـل**
**بـه نیـل دولـت شـاهی نباشـد**
**چنـان خـود را در آگاهـی کنـد گـم**
**کـه آگاهیـش از آگاهـی نباشـد**

حق سبحانه و تعالی، آن محبوب را به دولت آگاهی بخود محفوظ و از نکبت هرگونه مناهی و ملاهی محفوظ گرداند، آمین یا معین، اهل خانقاه دعا خوانند، خلاصه جناب ملا معروف و کاک سلطان و ملا صدرالدین و ملا احمد و سید هکذا، هکذا «باوۀلص» را دست بوسم و امیدوار مرحمت سرکار امیرتومانم.

**فـرق اسـت میـان آنکـه یـارش دربـر**
**بـا آنکـه دو چشـم انتظـارش بـردر**

مبلغ موعود را تا زودتر حاضر نمایند دیر است و لا خیر فی‌التأخیر است و تأخیر از او تقصیر است، امیدوارم که فقیر پر تقصیر بدین اندازه در ادای دین تأخیر و تقصیر نکند، أنه علی کل شئ قدیر و بالا جابه جدیر.

والسلام

### نامهٔ چهارم:

«سه‌یید» این نامه را برای کاک محمد «خاپۀحۀمۀ»فرزند آقا مؤمن‌بگ نوشته که انسانی خداشناس و مسلمان و متقی بوده است:

آقازادهٔ محترم کاک محمد را به عرض سلام مصدعم، تشکی نامه مشتمل بر استشفا و طلب تسلیه و رفع باد و بلا و خواهش دنیا و عقبی از اهل خانقاه را خواندم، اینست تعویذ را نوشته و افسون هوایی را روانه کردیم، خدای تعالی بشفای ظاهر و صفای باطن بر ما بندگان بی‌اطاعه و پر جفا منت نهاد و محض فضل بی‌انتها عفوتان کناد آمین، از وکالت دعاگو احوال ناساز را بپرسید و در خدمت شیزادگان روباه مزاج: آقا محمد امین بیگ و حسنخان به عرض دعا و سلام زحمت رسانم.

والسلام محمد رشید

چوارینه و دووبەیتییە فارسییەکانی «سەیید» زۆر ناسک و دڵڕفێن و پڕ لە هەست و سۆز و شاعیرانەن و لە هەندێ وشەی ڕەوان و ساکار و سادە و عامیانە ناوەرۆکی زۆر بەرز و جوان و دڵنشینی بەدیهێناوە، «سەیید» ئەم چوارینەی خوارەوەی لە وەڵامی مامۆستا مەلا عەزیزی مفتی‌دا نووسیوە کە نوێنەری خەڵکی شاری سەقز بووە لە کۆڕی شۆڕای ئیسلامی‌دا و یەکێک لە دۆستان و هاوفەقێیانی بەڕێز و خۆشەویستی پێشووی خۆی بووە و لە تارانەوە نامەی بۆ «سەیید» ناردووە:

**اگـر مـن فـی المثـل زاهـل تمیزم — زبیـدردان بیـدل درگریـزم**
**نشـان رفعـت قـدر اسـت یـارا — تعلّـق بـا همیـن شـخص عزیـزم**

❋ ❋ ❋

**شـد نِـی خامـه دلـم را ترجمـان — «بشـنو از نی چون حکایـت می‌کند»**
**بـا زبـان تیـز و چشـم اشـکبار — «از جدأیهـا شـکایت می‌کنـد»**

❋ ❋ ❋

**تـا سـایۀ پیـر تـو جدا شـد زسـرم — من خانه خـراب و بیکـس و دربدرم**
**ای سـایەی حـق بحق آن پیـر رئوف — محـض کرمت سـایەای آور به سـرم**

❋ ❋ ❋

**من خودم بـدم و زهر بـدی هم بترم — و زجملـۀ مـا سـیوای تـو در خطرم**
**حقّـا که تـو خیرو مـا همه شـر تمام — خـود را بتـو و تـرا بحق می‌سـپرم**

❋ ❋ ❋

**یار ما رخت سـفر هرگز نبستی کاشکی — یاچوبەستی‌راەمااز خودنبستی‌کاشکی**
**آن همـای دولتم اول نیفتـادی بدام — یا چو افتادی زدام ما نجسـتی کاشکی**

❋ ❋ ❋

**پنج‌شـنبه تـرا بخـواب دیـدم و الله — لب بـر لب تـو نهـاده دیـدم تا الله**
**بیـدار شـدم کسـی ندیـدم گفتـم — لاحـول و لا قـوه الاّ بـا الله**

❋ ❋ ❋

ای یـار چـرا رفتی و از یـار بریدی؟ از دام مـن خسـته غمبـار بریـدی؟
ای شوخ از این شـیفتهٔ زار چه دیدی؟ کـزوی برمیـدی و بر اغیـار تنیدی؟

* * *

در غیرتـم از صبـا کـه هرگـه و بیگه گسـتاخ رود بکـوی آن زیبـا مـه
او میـرود و مـن از قفـا می‌گویـم گریـان و لیتنـی کنـت مَعَـه

* * *

مانـده‌ام از یـار دور و زنـده‌ام زیـن گنـه تـا زنـده‌ام شـرمنده‌ام
بـرده‌ام لاغـر تنـی پیـش رقیـب اسـتخوانی پیـش سـگ افکنـده‌ام

* * *

من کیسـتم که نامه‌نویسی بسوی من؟ در طـی نامه درج کنـی آرزوی من؟
این دولتم بس است که گوش رضانهی گاهی که قاصـد بکنـد گفتگوی من؟

* * *

جانـا طلـب وصل تـو نتـوان کردن زین پس من و خون دل پیاپی خوردن
جـان را بخیـال روی تـو پـرودن شـبهای دراز را بـه روز آوردن

* * *

آن به کـه بلب مهـر خموشـی بنهیم و زدرد سـر خامـه و کاغـذ برهیـم
دانیم که از دوکون مقصود یکی اسـت فارغ زدوکـون دل به مقصـود دهیم

* * *

گـدای کـوی آن مقصـود را میـل بـه نیـل دولـت شـاهی نباشـد
چنـان خـود را در آگاهـی کند گم کـه آگاهیـش از آگاهـی نباشـد

## شێخی بورهان

**مـــێـــژووی ژیـــــانی عـــــارفی ڕەبـــبـــانی**
**شـێـخ یـوسـف شـەمـسـەدیـنی بـورهـانی**
**خـوانـاسـی پـایـەبـەرزی بـارەگـای سوبحانی**
**سـەر قافڵەی عابیدان و سۆفیانی روحـانی**
**لە ئاسمانی عیرفانا خۆرێکی تروسکەدار و نوورانی**
**بۆیە ناوبانگی دەرکـردووە بە شەمسی بورهانی**

ڕۆژی پڕشنگداری ئاسمانی ئایین و عیرفانی ئەو باسەمان ناوی یوسف و ناوی باوکی محەمەد و ناوی دایکی ئایشەیە، باوکی لە تاییفەی ماوەت و دایکی لە هۆزی کەڵهورە و لە ساڵی **١٣٤٢**ی کۆچی لە دێی سێڵوێ لە ئاواییەکانی ناوچەی لاجان هاتۆتە دونیاوە، هەر بە منداڵی باوکی کۆچی دوایی کردووە و دایکی چون هەر ئەو کوڕەی بووە، زۆری خۆشویستووە و بە پێی دابونەریتی ئەو سەردەمە ناویەتە بەرخوێندن و قورئانی پیرۆزی تەواو کردووە و چەند کتێبێکی خوێندووە و بووە بە فەقێ و هێندێک کتێبی نەحوو سەرفیشی خوێندووە و ئەوجار بۆ درێـژەدان بە خوێندن ڕووی کردۆتە شاری مەهاباد «سابلاغ» و لە لای گەلێ لە زانا پایەبەرزەکانی ئەو سەردەمە خوێندوویەتی، دایکی بۆ ئەوەی هەمیشە چاوەدێری و ئاگاداری لێبکا، ماڵی چووەتە دێی «یالآوە» کە بە سێ کیلۆمەتر کەوتۆتە ڕۆژهەلآتی شاری مەهاباد «سابلاغ»ەوە.

ئەو زاتە هەر بە منداڵی نیشانەی هۆشیاری و زیرەکی و بەختەوەری و گەورەیی بە ناو چاوانیەوە دیار بووە و شێوەی ساڵحان و پیاوچاکانی بە خۆیەوە گرتووە و لە فەقێیەتیدا زۆریش بە خوداپەرستییەوە خەریک بووە و نوێژی سوننەت وشەو نوێژی هەمیشە کردووە و ئارەزووی لە سۆفیەتی و سولوک بووە، لە سەر ئەو ئارەزووە شەوێک خەوی بە خوداناسی پایەبەرز و پیر و موڕشیدی بەناوبانگی تەریقەت خوداڵێخۆشبوو حەزرەتی شێخ

عوسمان سیراجەدینەوە دیوە و لەو خەوەدا حەزرەتی شێخ بانگی کردووە بۆ تەوێڵە.

شێخ یوسف شەمسەدین دوای چەند ڕۆژ بیرکردنەوە هەواڵی نییازی سەفەری خۆی بۆ تەوێڵە لە ناو فەقێکان و هاوڕێیان و دۆستەکانیدا بڵاو دەکاتەوە و ڕۆژێک لە ڕۆژان لە شاری مەهابادەوە بەرەوشاری سەردەشت دەکەوێتە ڕێ و دوای چەند ڕۆژ مانەوە لەو شارە لەگەڵ چەند کەسێک لە دانیشتووانی سەردەشت دەچێت بۆ تەوێڵە و بە خزمەتی پیر و مورشیدی خۆی شێخ عوسمان سیراجەدینی نەقشبەندی دەگا و تکای لێدەکا کە شێوەی تەریقەتی فێر بکا، حەزرەتی شێخیش زۆری دڵخۆشی دەداتەوە و بەو پەڕی سەفا و لوتفەوە تکاکەی وەردەگرێ و شێوەی تەریقەتی نەقشبەندی فێر دەکا و نیشانی دەدا، کە چۆن ویرد و زیکری خۆی بەجێبێنێ و بەو جۆرە بووە بە مریدی شێخعوسمانی سیراجەدین و ماوەی یازدە ساڵ لە دێی تەوێڵە ماوەتەوە و لەو ماوەیەدا وەکو مریدێکی بە سۆز خەریکی خوداناسی و خوداپەرستی و ڕییازەت و تەزکییەی نەفس و سولوک و بەجێهێنانی شێوەی تەریقەت بووە و کاتی خۆی بە فیڕۆ نەداوە و بە هەموو جۆرێک بە شێوەی تەسەووفەوە خەریک بووە و ڕۆژ بە ڕۆژ بووە بە جێگای تەوەججوهاتی شێخی سیراجەدین و بەردەوام لە بەرزبوونەوەدا بووە.

شێخیوسف شەمسەدین دوای تەواو کردنی دەورەی سەیر و سولوک لە سەفەرێکدا کە لەگەڵ شێخی سیراجەدین دەچێت بۆ سولەیمانی بە فەرمانی شێخ لە خانەقای خواناس و مورشیدی نێو بەدەرەوەی تەریقەت حەزرەتی مەولانا خالیدی نەقشبەندی حازر دەبێ و شێخ عوسمان ئیجازەی خەلافەت و ئیرشادی دەداتێ و پێی دەفەرموێ کە بگەڕێتەوە بۆ ناوچەی موکریان و دەس بکا بە ڕێگا پێشاندانی ئەوانەی بە دوای ڕێگای خواناسیدا دەگەڕێن، شێخ یوسفیش ئامادەیی خۆی بۆ بەجێهێنانی فەرمانەکانی شێخ عوسمان پێشان دەدا، پاش ئەوە شێخ یوسف دەکەوێتە ڕێ و دەگەڕێتەوە بۆ ناوچەی موکریان و ماوەیەک لەگەڵ دایکی خۆشەویستی لە دێی «یالآوەی

سەرێ» دادەنیشێ و دوای ماوەیەک لەوێشەوە دەچێتە ئاوایی «عیساکەند» و ماوەی دوو ساڵیش لەوێ دەمێنێتەوە و لە پاشانا کۆچ دەکا و دەچێتە ئاوایی بورهان و هەر لەو شوێنە کە لە دێی «بورهان» نیشتەجێ دەبێ دەست دەکا بە سولوک کردن و بەجێهێنانی شێوەی تەریقەت و ڕێنوێنی کردنی موسوڵمانان بە پێی دابونەریتی تەریقەتی نەقشبەندی خانەقایەکی گەورە لە دێی «بورهان» دروست دەکا و ئەو خانەقایە هەر لەو کاتەوە بە خانەقای «شێخی بورهان» ناوبانگی دەر کردووە و ماڵ و ملکێکی زۆری لە سەر وەقف دەکا و زانایان و ئەهلی تەریقەت لە هەموو لایەکەوە ڕووی تێدەکەن، شێخ یوسف لەو ماوەیەدا کە دەس دەکا بە ئیرشادی تەریقەتی نەقشبەندی خەڵکێکی زۆر لە زانایان و ڕوحانیان و داخوازانی سولوک لە هەموو لایەکەوە دێن بۆ خزمەتی و تەریقەت لە سەر دەستی وەردەگرن و ناوبانگ و شۆرەتی بە هەموو لایەکدا بڵاو دەبێتەوە و مرید ومەنسووب لە هەموو شوێنی وڵاتەوە دادەبارێن بە سەریدا و گەلێ پیاوی زانا و گەورە و کەسانی پایەبەرزی وەک مەولانا محەمەد سادقی مەرزنگ و خواناس و عارفی بەناوبانگ حاجی سەیید محەممەد سەعیدی نوورانی و شاعیرانی ناسکخەیاڵ و هونەرمەند و بەهرەمەندی وەک مامۆستا مەلا ساڵحی «حەریق» و مامۆستا مەلا سەیید ڕەشید و مامۆستا مەلا حەسەنی سەیفول قوزات مامی پێشیەوا قازی محەمەد و کەسانی دی لە سەر دەستی شێخ یوسفدا سولوکیان کردووە و تەربیەتی ڕوحی و سۆفیانەیان وەرگرتووە.

هەر لەو ماوەیەدا «شێخی بورهان» ویستوویەتی بچێت بۆ حەج و فەرزی حەج بەجێبێنێ، هەموو شتێک ئامادە کراوە و چەند کەس لە مرید و مەنسووبانی کە یەکێک لەوان زانا و شاعیری خواناس و سۆفی سەیید محەمەد سەعیدی نوورانی کە لە سەییدەکانی «کولیجە» بووە لەگەڵ شێخی بورهان لە ڕێی وڵاتی عوسمانی و میسرەوە چون بۆ ماڵی خودا و لە ڕێی دیمەشق و بەغدا و هەولێرەوە هاتوونەوە بۆ وڵاتی خۆیان، هێشتا شێخ یوسفی بورهان لە سەفەری حیجاز نەگەڕاوەتەوە کە زانای خواناس مەولانا محەمەد سادقی مەرزنگ، مریدی دڵسۆز و

دروستکاری شێخ بە یارمەتی مرید و مەنسووبەکانیتر دوو دانگی دێی شەرەفکەندی کڕیوە کە بە سیوپێچ کیلومیتر کەوتۆتە ڕۆژئاوای شاری بۆکان و شێخ یوسف دوای گەڕانەوە لەو دێیەدا نیشتەجێ بووە و خانەقا و چەند هۆدەیەکی لەوێ دروست کردووە، چون ناوبانگ و شۆرەتی ئەو زاتە لە ئاوایی شەرەفکەندەوە بە هەموو لایەکدا بڵاو دەبێتەوە مریدان و مەنسووبان و بەتایبەت زانایان و ڕوحانیان لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستانەوە دادەبارێن بە سەریدا و هەر ئەوە دەبێتە هۆی ئەوە کە لە دێی شەرەفکەند نەمێنێتەوە، هەر بەم هۆیەوە لە پارچە زەویەکدا کە بە «سۆڵاوکان» بەناوبانگە و بە دووکیلۆمیتر کەوتۆتە ڕۆژئاوای شەرەفکەندەوە خانەقایەک و چەند حوجرە و خانووی لێدروست کردووە و ئەو شوێنە هەر لەو سەردەمەوە بە «خانەقا» ناوبانگی دەرکردووە و شێخ یوسف شەمسەدین ماوەی هەژدە ساڵ لە خانەقا دەمێنێتەوە.

ئەوەی شایانی باس بێ ئەوەیە کە دوای چەند ساڵ نیشتەجێ بوون لە خانەقا ئاوایی «ئاتابڵاغی» کڕیوە کە بە دە کیلۆمیترێک کەوتۆتە ڕۆژئاوای شاری بۆکان و ڕووبەڕووی گوندی «حاجیلەک»ی شاروێرانە و ئەو گوندەشی وەقفی «خانەقا» کردووە.

شێخ یوسف پیاوێکی جوانچاک و باڵابەرز و سوورکارە و ڕیشێکی تەنگی بووە و ڕوخساری وای نیشان داوە کە لە پێشدا قەیافەیەکی بەهێزی بووە، بەڵام عیبادەت و ڕییازەت و نوێژ کردن و ڕۆژ و گرتن و چلەنشینی و نەفسکوژی و ساڵانی سەردەمی سولوک و هەڵگرتنی باری قورس و گرانی ئیرشاد بڕستی لێ بریوە و جەستە و ئەندامی کز و بێ هێز کرووە، شێخ یوسف پیاوێکی قسەزان و زمانپاراو و ڕەوانبێژ و ڕاکێشەر بووە و لەگەڵ خەڵکی ئاساییدا بە زمانی خۆیان قسەی کردووە و لە خۆنوواندن و خۆ بە زل زانین و فیزودەعیە بێزار بووە و زۆر هێمن و لەسەرەخۆ قسەی کردووە، کاتێ کە بزەو زەردەخەنەی هاتۆتە سەر لێو، پشتی دەستی لە سەر دەمی داناوە و هیچ کاتێ بە قاقا پێنەکەنیوە.

شێخ یوسف هەر کە چووە بۆ دێی «بورهان» یەکەم ژنی

هێناوه و خێزانی یەکەمی کە ژنێکی زۆر پاک و پارێزگار بووە ناوی «خانسخاتوون» بووە و ئەو ژنەی دوای ماوەیەک بەبێ ئەوەی منداڵی ببێ کۆچی دوایی کردووە، خێزانی دووەمی کچێک بووە لە سەییدەکانی «کولیجە» و ناوی سەییدزادە «مرۆت» بووە و لەو خێزانەی سێ کوڕ و سێ کچی بووە، کوڕەکانی ناویان شێخعەبدولڕەحمان و شێخ ئەحمەد و شێخ عەبدورڕحیم بووە و کچەکانیش زێنەب خاتوون و خەدیجەخاتوون و فاتمە خاتوون بوون، خێزانی سێیەمی ناوی «یاسەمەن خاتوون» بووە و لەو ژنەی چوار کوڕ و کچێکی بووە، کوڕەکانی ناویان شێخ عەبدوڵڵا و شێخ ئیبراهیم و شێخ محەمەد و شێخ عەبدولقادر و کچەکەشی ناوی ئامینەخاتوون بووە، خێزانی چوارەمی بێوەژنێک بووە بە ناوی سەییدزادە ئامین کە لە پێشدا ژنی خواناسی پایەبڵیند حاجیسەیید محەمەد سەعیدی نوورانی خەلیفە و مریدی دروستکاری بووە کە دوای وەفاتی ئەو پیاوە گەورە و بەڕێزە لە ساڵی **١٣٠٦**ی کۆچی مانگی بۆ ئەوەی منداڵەکانی بێ سەرپەرست نەمێننەوە ئەو ژنەشی مارە کردووە و لەو خێزانەشی چوار کوڕ و کچێکی بووە، کوڕەکانی ناویان شێخ ساڵح و شێخ حەسەن و شێخ عەلی و شێخ حوسێن و کچەکەشی ناوی «مریەمخاتوون» بووە. ئەو پیرە بە بیر و ژیرە سەرەنجام لە شەوی یەکشەممەی یازدەی مانگی دووەمی ساڵی **١٣٢٨**ی کۆچی مانگی لە تەمەنی هەشتاوشەش ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە و پاش شوشتن و کفن کردنی ژمارەیەکی زۆر لە خەلیفە و مرید و مەنسووبەکانی لە هەڵگرتنی جەنازەکەیدا بەشداریان کردووە و لە پێنجسەد میتری ڕۆژئاوای خانەقا و لە سەر تەپۆڵکەیەک بە خاکیان ئەسپاردووە.

ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە دوای وەفاتی شێخ، مەولانا محەمەدسادقی مەرزنگ کە خەلیفەیەکی شایان و لێهاتووی شێخ بووە لەسەر خانەقا ماوەتەوە و سەرپەرستی کاروباری دینی و دنیایی خانەقاشی کردووە و لە هەموو لایەکەوە خەڵک ڕوویان تێکردووە و هەمیشە خانەقا پڕ بووە لە مرید و مەنسووب کە لە زۆر لای کوردستانەوە هاتوون، مەولانا پیاوێکی هوشیار و زانا و شارەزای

ئوسولی دین و تەریقەت و مەلایەکی باش بووە و بۆ کاروباری دونیایی خانەقاش هەر والێهاتوو بووە، سەرەنجام ئەویش تا ئەو ڕۆژەی کۆچی دوایی دەکا بە ئیرشاد کردن و ڕێنوێنی کردنی موسوڵمانان و خزمەتکردنیانەوە خەریک بووە و داخوازانی زۆری تەریقەت لە هەموو لایەکەوە لێی کۆ دەبنەوە.

زانای خواناس و پایەبەرزی کورد خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەریس «نامی» لە بەرگی دووەمی کتێبی «یادی مەردان»دا لە بارەی شێخی بورهانەوە نووسیویەتی و دەڵێ:

**یادی شێخی بورهان**

ئەم زاتە ناوی یوسف و لەقەبی شەمسەدین و خەڵکی دێی «بورهان» و لە هۆزی بلّباس بووە، پاش ئەوەی لە خوێندندا ئەگاتە پلەوپایەیەکی بەرز، ئەڕوا بۆ هەورامان و لەسەر دەستی شێخ عوسمان سیراجەدیندا تەمەسوک ئەکا و خەریکی ئادابی تەریقەت ئەبێ، تا پاش ماوەیەک ئیجازەی خەلافەت وەرئەگرێ و ئەگەڕێتەوە بۆ وڵاتی موکریان و دەست ئەکا بە ئامۆژگاری کردن و ڕێ پێشاندانی موسوڵمانان.

ئەم زاتە یەکمجار لە دێی بورهان و پاشان لە شەرەفکەند و ئەوجا لە «سولاڤکان» ئیرشادی کردووە و لەمەی دواییاندا خانەقای دروست کرووە، ئەم زاتە گەلێ سیفەتی پیاوانەی تیابووە وەک ئەوە کە:

١ ـ لە سەر هەموو مریدێکی پێویست کردووە ئەگەر نەخوێندار بێ دەرسی قورئان بخوێنێ بە تەجویدەوە و هەموو ڕۆژێ بە گوێرەی توانا دەوری هەندێکی بکاتەوە.

٢- ئەهمییەتدانی بە سونەتی پێغەمبەر دروودی خوای لێبێ، بەتایبەتی لە ئادابی دەستنوێژ و ڕۆژوو و مەناسیکی حەجدا.

٣ ـ بڕیاری داوە لە سەر هەموو مەنسوبێکی کە نانی کاسبی و ڕەنجی شانی خۆی بخوا، مەگەر تووشی دەردێکی وابووبێ کە ڕێگای کاسبی کردنی لێگرتبێ، ئەوە ئەتوانێ دانیشێ و خەڵک خزمەتی بکەن.

٤ ـ خۆیشی بۆ خۆی کاسبی کردووە و نانی خانەقای لە کەسبی دەستی خۆی داوە و ساڵانە ئەوەندە بەروبووی کاسپی و کشتوکاڵی بووە زەکاتی ماڵی بە گەلێ کەس هەژار و کەمدەسەڵات داوە و دێی «ئاغەبلاغی» کڕیوە و وەقفی کردووە بۆ هەژاران و کەسانی عیبادەتکار و ڕێبوارانی خانەقاکەی.

**٥** ـ کە لە ساڵی **١٣٣٣**دا نەخۆش کەوتووە وەسیەتی کردووە لە کوڕانی کەسیان جێی نەگرێتەوە، چونکە کەسیان سلووکی تەریقەتی نەبۆوە و شایانی ئیرشاد کردن نەبوون، کاری وا لە هەموو کەسێک ناوشێتەوە و نیشانەی پلەیەکی بەرزی ڕاستگۆییە لەگەڵ خوا و خۆ و خەڵکدا، بۆ سەر پەرشتی کردنی کاروباری ئەو قافی خانەقاکەشی ناوی دوازدە کەسی بەریز هێناوە، هەروا بڕیاری داوە دوای مردنی ئەو دوازدە کەسە هەموویان، ئەهلی خانەقا خۆیان یەکێک هەڵبژێرن و بیکەن بە سەرپەرشتی کەری کاروباری خانەقا و ئەو قافی خانەقا، لە ئەنجامی ئەم ڕەوشتە بەرزانەیەوە بووە شێخ محەمەدی کوڕیشی وا پەروەردە بووە کە وا لەگەڵ ئەوەیش کە مەلایەکی زانا و پایەبڵند بووە نەیهێشتووە بە ناوی شێخەتییەوە کەس دەستی ماچ کات، شێخی بورهان بە سەر تەپۆڵکەیەکی بەرزەوە لە نزیکی خانەقا کە یا بە خاک سپێراوە.

هەروەها خوالێخۆشبوو مامۆستا عەلائەدین سەجادی لە بەرگی حەوتەمی «ڕشتە مرواری»دا نووسیویەتی: بورهان گوندێکە لە وڵاتی موکریان، شێخێکی لێبووە بە ناوی «شێخی بورهان»ەوە ناوی دەر کردووە، ناوە ئەسڵیەکەی «یوسف» و لەقەبی شەمسەدین بوو، سەردەمی ژیانی سەدەی نۆزدەهەم بوو، شێخی بورهان یەکێک بووە لە شێخە پایەبەرزەکانی سەر بە بنەماڵەی شێخانی تەوێڵە لە کۆری ئاگردانی مەولانا خالیدی نەقشبەندی.

شێخی بورهان شێخی ڕاستەقینە بووە، خۆی پیاوێکی دەوەڵەمەندی بە ڕاستی دەوڵەمەند بووە، دەوڵەتەکەی لە کۆششی خۆی و لە میراتی باب و باپیریەوە بۆ ماوەتەوە، چاوی لە دەستی خەڵک نەبووە، نانی داوە بە خەڵک و نانی کەسی وەرنەگرتووە.

له ماڵی تایبەتی خۆی «**٣٠**» مانگا و پێنج جووته گاو ده ئێستری تەرخان کردووه بۆ خانەقا، کاروان و جوتیار و دارکێشی بۆ ڕاگرتوون، شیری ئەم مانگایانه بۆ ماست و دۆی ئاوەن و ڕۆنی مریدانی خانەقا، بەرهەمی جووتەکانیش بۆ نانی خانەقا، ئێسترەکانیش هەموو ڕۆژێ نێرراون بۆ دار و سووتەمەنی خانەقا، ئەو عالەمه له دوور و نزیکەوه هاتوون و شۆرباو هەموو شت حازر بووه، چەنده لەوێ مابنەوه به زکر و فیکرەوه ڕایانبواردووه، ئەگەر مریدەکانیش شتیان هێنابێ پیاوی تایبەتی هەبووه لێی وەرگرتوون و هەر له خانەقادا عەمبار هەبووه براوەته ئەوێ و دەرخـواردی مریدان دراوه به بێ ئەوه تێکەڵاو به ماڵی شێخ کرابێ.

ڕابواردنی خوێشی وابوو گوێدرێژێکی هەبوو هەموو ڕۆژێ سوار بووه بۆ سەر ڕەزوزەوی و زاری خۆی، خۆی به دەستی خۆی بژاری ڕەزی کردووه، بێڵکاری کردووه، به دەستی خۆی گەنمی وەشاندووه، ئاوی داوه و دروویەتەوه، شەن و بای کردووه و بردوویەته ئاش هاڕیویەتی، لەوه له ماڵەوه نانی بۆ دروستکراوه، وەکو بلێیتدا ئیما له ڕیازەت و چەوسانەوەی نەفسدا بووه، زۆرتر خواردنی لەو نان و شۆربایه بووه که خۆی به دەستی خۆی هێناویەته دەست، میوەی ئەخوارد ئەویش هەر لەوه که خۆی به دەستی خۆی له ڕەزەکانا ئەیهێنایه ئەنجام، هەموو دەم دەرزی و دەزووی پێ بووه جلەکانی خۆی پێ ئەدروەوه، به هیچ جۆر ئەرکی نەئەخسته سەر کەس، له کۆڕی موراقەبەی سۆفیەکانا ئەچوو سەری ئەنابه سینگیانەوه موراقەبەی ئەکردن، هەموو ساڵێکیش چلەی ئەکێشا، ئەمه بوو شێخی بورهان.

## ناوەرۆک